# ئیعجازی زمانەوانی
# لە قورئانی پیرۆزدا
## خوێندنەوەیەکی نوێ

پوختە و کورتکراوەی کتێبی

پەرجوو، سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئیعجازی زمانەوانی لەقورئانی پیرۆزدا

ئەحمەد بەسسام ساعی

وەرگێڕانی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی





لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (١٠٥)

# ئیعجازی زمانەوانی لە قورئانی پیرۆزدا
# خوێندنەوەیەکی نوێ

بەرگی یەکەم

پوختە و کورتکراوەی کتێبی: (پەرجوو، سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئیعجازی زمانەوانی لە قورئانی پیرۆزدا)

نوسینی: ئەحمەد بەسسام ساعی
وەرگێڕانی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی

# ئیعجازی زمانەوانی لە قورئانی پیرۆزدا
## خوێندنەوەیەکی نوێ



لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە (١٠٥)


- نووسینی: ئەحمەد بەسسام ساعی
- وەرگێڕانی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپ: یەکەم ـ ٢٠٢١ ـ ناوەندی ڕێنوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٣٧٤)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: عێراق ـ سلێمانی ـ شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی – نزیک پردی خەسرەوخاڵ

# ناوەرۆك

ئیعجاز، یان تەنها بلیمەتیی و بەس؟ ........................................ ١٦
ئیعجاز لای زانایانی پێشین ........................................ ٢٠
یەکەم: لایەنی جوانیی یان ڕەوانبێژیی ........................................ ٢٠
دووەم: لایەنی دەربڕین ........................................ ٢١
سێهەم: لایەنی زانستی ........................................ ٢١
کاریگەریی شۆکی نوێگەریی لەسەر تاکی عەرەبی یەکەمین ........................................ ٢٥
قەبارەی ڕاستەقینەی ئیعجازیی نوێگەری ........................................ ٢٧
چڕێتیی ئیعجاز لەپێگە نوێگەرییەکاندا ........................................ ٢٩
هەژموونی سەرسوڕهێنەرانەی بنیاتی نوێی ڕێکئاوازیی "ڕیتم" لای عەرەب ٣٢
گەشتەکەم لەئامێزی زەمەندا: ........................................ ٣٤
لەنێوان فەرهەنگی قورئان و فەرهەنگی نەفامی و فەرهەنگی نەبەویدا ..... ٣٧
شۆڕشە زمانەوانییە نوێیەکە ........................................ ٣٩
کەسێتیی "سورەتەکان"ی قورئان ........................................ ٤٢
ئایا کەسێتیی سورەتەکان تێکەڵ یەك دەبن؟ ........................................ ٤٥
لەنێوان هەردوو سورەتی (الاعلی) و (اللیل)دا ........................................ ٤٦
کەسایەتیی بێوێنە "تاقانەیی" لەقورئاندا ........................................ ٤٨
قاڵبە زمانەوانییە نوێیەکان ........................................ ٥٣
زۆرینەی قاڵبەکانی قورئان، دووبارە نابنەوە تیایدا ........................................ ٥٥
چڕیی قاڵبە قورئانییە ناوازەکان ........................................ ٥٨
سروشتی قاڵبی قورئانی و داڕشتنەکەی ........................................ ٦١

سورەتێکی هاوشێوە بهێنن .......................... ٦٦
قاڵبی پێغەمبەرانە، قاڵبی زمانەوانیی فەرموودە .................. ٦٧
نوێگەریی دارِشتە و گوزارشت .......................... ٧١
دارِشتەی قورئانی .......................... ٧٢
دارِشتە و گوزارشتە نوێیەکان لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا .......... ٧٤
وشەکان و ئیعجازی کۆکردنەوە لەنێوان "نوێگەری و ڕوونی" ............ ٧٦
گرنگیی وشە نوێیەکان .......................... ٧٨
وشە نوێیەکان لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا .......................... ٨٣
بەکارهێنانی نوێی ئامرازەکان لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا .......... ٨٤
سەرلەنوێ پێکهێنان و دارِشتنەوەی یەکە زمانەوانییەکان .......... ٨٧
دۆخی نوێی ئامرازە پەیوەندییە کلاسیکییەکان (ئامرازی بەیەکەوەبەستن) ٩٠
پەیوەندییە نوێیەکانی نێوان وشەکان .......................... ٩٢
فەرهەنگی نوێی قورئانیی وێنەکان .......................... ٩٦
وێنە فرەڕەهەندەکان .......................... ١٠٠
وێنەی گریمانەیی .......................... ١٠٠
جۆرەکانی وێنە لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا .......................... ١٠٤
بادانەوە "الالتفات" هونەرێکی تایبەت بە قورئان .................. ١٠٦
بادانەوە (الالتفات) لە کات و زەمەندا .......................... ١١٠
بادانەوە "الالتفات" لەحاڵەتی ئیعرابیدا .......................... ١١٢
زمانی کراوە و واتافراوان .......................... ١١٦
پێگە کرانەوەییەکان لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا .......................... ١٢٣
فرەیی لەخوێندنەوەی قورئان (قیرائات) و کرانەوە و فرەواتایی ......... ١٢٥

## پێشەکی سەنتەری زەهاوی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری سەروەر و سەرجەم یار و یاوەرانی.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، خۆی بە خۆشحاڵ دەزانێت کە لەزنجیرە کتێبەکانیدا ئەمجارە کار لەسەر کتێبێکی نایاب و نوێ دەکات کە دەچێتە چوارچێوەی خزمەتی قورئان و توێژینەوە قورئانییەکان، لەسۆنگەی وردبوونەوە لەم پەرتوکە ئاسمانییە و کاریگەرییە درێژخایەنەکانی بەپێویستمان زانی کە گرنگیی بدەین بە بواری زمانەوانیی قورئانی پیرۆز و بۆ ئەو مەبەستەش ئەم کتێبەی (د.ئەحمەد بەسسام ساعی)مان هەڵبژارد بۆ وەرگێڕان کە تیایدا نوسەر بە وردیی خاڵە کاریگەر و ئیعجازەکانی قورئانی پیرۆز شیدەکاتەوە و نمونەی هەموو بابەتەکانیشی لە ئایەتەکاندا بەرجەستە دەکات. هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم کتێبەش بۆ دوو خاڵی سەرەکیی دەگێڕینەوە:

یەکەم: کتێب لەبواری زمانەوانیی قورئانی پیرۆزدا، بە زمانی شیرینی کوردی کەمە، لەبەرئەوەی قورئان بە زمانی عەرەبییە و بابەتە زمانەوانییەکانیشی هەر بەو زمانەن ئەمە وایکردووە تا ئێستا کەمترین کار لەسەر ئەو بوارە بکرێت. ئەمەی سەنتەری زەهاوی کردوویەتی، دەچێتە بواری ناساندنی ئیعجازە زمانەوانییەکەی قورئان بە زمانی کوردی و بۆ خوێنەری کوردزمان.

دووەمیان: لەوانەیە زۆرمان ئەو پرسیارەمان بۆ دروست بووبێت کە: ئایا بۆچی کە خوای گەورە تەحەددای قورەیش و زمانزان و

شـــارەزایانی عەرەبـــی کـــرد بە نوســـینی نمـــونەیەک، یـــان ســـورەتێکی هاوشـێوەی قورئـــان، کەس - سـەرەڕای دژایەتیـی سەرسـەختیان بـۆ قورئان - نەیتوانی وەڵامی ئەو داواکارییە بداتەوە و دێڕێکی هاوشێوەی قورئـــان بنوســـێت. قورئـــان چـــی نهێنییەکـــی لەدووتـــوێی وشـــەکانیدا هەڵگرتـــووە تـــا ببێـــتە خـــاڵی بەهێـــزی کە کەس نەتوانێـــت هاوشـــێوەی بنوسێت، جا ئەم کتێبە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: بۆچی نەیانتوانی؟

لەکۆتاییـــدا لەخـــوای گەورە داواکـــارین ئەم هەوڵە ببێـــتە توێشـــووی خزمەتکردن بە کتێبە پیرۆزەکەی و هەمـوو لایەک بەوردبوونەوە لێی، بەهرەوەر بکات.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری.

## دەروازە

سەرەتای ئەم کارە، ساڵی (١٩٨٩) بوو، ئەوکاتەی کە (ناوەندی ئۆکسفۆرد بۆ توێژینەوە ئیسلامییەکان) داوایان لێکردم وانە بەکۆمەڵێك قوتابی بەریتانی بڵێمەوە کە دەیانویست لەڕێی قورئانی پیرۆزەوە لەزمانی عەرەبی تێبگەن و فێری ببن. ئەزموونێکی ناوازە بوو بۆ من کە هەوڵی ئەوەم دەدا ماناکانی قورئان بۆ قوتابییەکانم وەربگێڕمە سەر زمانی ئینگلیزی و پاشان وەڵامی پرسیارەکانیان لەوبارەوە بدەمەوە، پرسیارەکانیان کە پرسیارگەلێکی زمانەوانیی سەرسامکەری ئەوتۆ بوون کە پەلکێشی دەکردیت بۆ بیرکردنەوەیەکی دوور لەسنوری ئەو نەریت و باوانەی کە ڕاڤەکارانی قورئان (موفەسسیرەکان) و زمانەوانان پێیڕاهاتبوون و باسیان دەکرد.

وا ڕێککەوت هەر لەو سەروبەندەدا لەگەڵ خۆرهەڵاتناسێکی بەریتانیی هاوڕێمدا لەکۆلێژی توێژینەوە خۆرهەڵاتییەکان لەزانکۆی ئۆکسفۆرد سەرقاڵی کۆڵینەوە (تەحقیق)ی کتێبێکی سەردەمی ئەندەلوسی بووم، ڕۆژێك پرسیاری لێکردم: ئایا لە زمانی عەرەبیدا دەڵێین: (مَا زَالَ)، یاخود (لا زَالَ)؟ منیش سادەییانە وەڵامدایەوە: دەڵێین (مَا زَالَ). بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر (لا زَالَ)، منیش لەسەر (مَا زَالَ). لەکۆتاییدا شۆکی کردم بەقسەیەکی کە وتی: یەکێکتان هەڵەن: تۆ، یان خوا. جا بۆ ئەوەی لە

سەرسامبوون و شۆکبوونەکەم ڕزگارم بکات وتی: قورئـانی پـیرۆز تـەنها و تەنها (لا زَالَ)ی بەکارهێناوە.

بۆ ساتێك ورتەم لێبڕا، پاشان هاتمەوە سەرخۆم و بەم پرسیارە کتوپڕ گـرتم: چـۆن کـرداری (کَـانَ) وەردەگێڕیتــە ســەر زمـانی ئینگلیـزی؟ بـێ وەستان وتی: بە(was)، وتم: کەوایە ئەم ڕستە قورئانییەم بۆ وەربگێڕە: (وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَحِيمًا)، دەستبەجێ وەڵامی دامەوە:
.(and Allah is oft forgiving most merciful)

لێمپرسی: ئەی کوا کرداری (کَـانَ) لـەو وەرگێڕانـەدا؟ وەڵامـی نـەبوو. چونکە تەنها (Is)ی لەڕستەکەدا بەدی کرد کـە ئـەویش بـەمانای (يَكُـون) یان (إنّ) دێت نەك بەمانای (کَانَ).

بەڕاستی قورئانی پیرۆز زمان و بەکارهێنانی زمانەوانی تایبەت بـەخۆی هەیە کە جیاوازە لەبەکارهێنانە زمانەوانییە مرۆییەکانی ئێمە، چ فەرمی و چ ڕۆژانەییــەکانمان. تــا ئێســتا کــەس، تەنانــەت خــودی پێغەمبــەریش (سەلامی خـوای لێبێـت)، کـرداری (کَـانَ)ی بـەمانای (إنَّ) بەکارنـەهێناوە لەکاتێکدا لەقورئاندا بەو مانایە (١٩٠) جار هاتووە. بەڵام کاتێك گەڕامەوە بۆ قورئانی پیرۆز تا ئەو قسەیەی هاوکارە خۆرهەڵاتناسـەکەم بسەلـمێنم لەبارەی (ما زَالَ)ـەوە، شۆکبووم بەوەی کە کە قورئان تەنها (مَا)ی لەگەڵ کرداره ڕابردووەکەی بەکارهێناوە، واتە (ما زَالَ)، و (لا)ی لەگـەڵ کـرداره ڕانەبردووەکەی بەکارهێناوە واتە (لا يزَال)، لـەتێکڕای قورئانـدا (لا زَالَ) و (ما يزَال) نابینین. بەڵام سەرسامکەرە گەورەکە لـەجیاوازیی بـەکارهێنانی قورئاندا بـوو بـۆ ئـەو کـرداره بەهــەردوو شـێوازی ڕابـردوو و ڕانـەبردووی،

لەگەڵ بەکارهێنانی ئێمەدا. ئێمە کاتێك دەڵێین: (ما زَالَ المطرُ يهطل) (هێشتا باران دەبارێت)، گوێگر تێدەگات کە باران پێشتر باریوە و ئێستاش تا ئەم ساتە بەردەوامە لەبارین. کردارەکە (ما زَالَ) هەردوو دەمی فرمانی ڕابردوو و ئێستا لەخۆدەگرێت، بەڵام ناپەڕێتەوە بۆ دەمی فرمانی داهاتوو. عەرەب ئاوا ئەو کردارە بەکاردەهێنن لەبەکارهێنانی زمانەوانیی مرۆیی خۆماندا. بەڵام دارشتەی ڕابردووی (ما زَالَ) لەو دوو تاقە ئایەتەی کە تیایاندا هاتووە تەنها دەمی فرمانی (ڕابردوو) بێ دەمی فرمانی (ئێستا) دەگرێتەوە. کردارەکە لەهەردوو ئایەتەکەدا بەمانای (ظَلَّ) (هەمیشە) یان (بەردەوام)ـبوونی شتێك لە کاتی ڕابردوو و پاشان پچڕابێت و وەها نەمابێتەوە، بەکارهاتووە:

(فَمَا زَالَتْ تِلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّى جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ). (الانبياء: ١٥).

واتە: "بەردەوام هەر ئەوە قسەیانە هەتا هەموویانمان دروێنە و خامۆش کرد".

(وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِنْ قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِمَّا جَاءَكُمْ بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَنْ يَبْعَثَ اللَّهُ مِنْ بَعْدِهِ رَسُولًا). (غافر: ٣٤).

واتە: "سوێند بەخوا بەڕاستی کاتی خۆی یوسف بەڵگە و نیشانەی زۆری بۆ هێنان تا ڕێبازی خواناسی بگرن، کەچی بەردەوام لەگوماندا بوون بەرامبەر ئەو بەرنامە و ئاینەی کە بۆی هێنابوون، هەتا ئەوکاتەی وەفاتی کرد ئەوسا وتتان: ئیتر تەواو، هەرگیز خوا دوای ئەو پێغەمبەری دیکە نانێرێت".

ئایــەتی یەکــەم مانــای ئەوەیــە کــە ئــەوان بــەردەوام بــوون لەبانگەشــەکەیاندا "لــەڕابردوودا" هــەتا لــەناوبران و کۆتاییــان پێهــات "لەڕابردوودا". ئایەتی دووەمیش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە پارێزگاریتان لەگومانەکەتان کرد "لــەڕابردوودا" بەرامبــەر بــە یوسـف تـا وەفـاتی کـرد "هەر لەڕابردوودا". بەو جۆرە کـاتی هــەردوو کردارەکـە هــەر لــەڕابردوودا دەسـتیپێکرد و هــەر لەڕابردوویشـدا کۆتاییـان پێهـات، بەبێئــەوەی بێنــە سنوری کاتی "ئێستا"وە.

هەرچــی دارشــتەی کــرداری "ڕانــەبردوو"ی کردارەکەیــە (لَـا يَــزَالُ) لەبەکارهێنانی زمانەوانیی قورئانی پیرۆزدا ئەوە هــەر ســێ دەمــی فرمـانی (ڕابــردوو و ئێســتا و داهــاتوو) پێکــەوە دەگرێتــەوە، کــە مەبەســت لێــی: کارەکە، لــەڕابردوودا وابــووە و ئێســتاش وەهایــە و هــەروەهاش بــەردەوام دەبێت لەئایندەدا، ئەمە لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ڕوونتر دەردەکەوێت:

(وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ) (البقرة: ٢١٧).

واتە: "بێباوەڕان بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێبکەن لــەدین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە".

(لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ). (التوبة: ١١٠).

واتە: "ئەو بینایەی کە دووڕووان دروستیان کرد، بەردەوام هۆی گومان و زیـادبوونی دڵەڕاوکێیــە لەدڵیانــدا، هــەتا ئەوکاتــەی دڵیــان دەپچــڕێت و دەمرن".

(وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ) إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ). (هود: ١١٨–١١٩).

واته: "خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بە یەك تاقم و کۆمەڵ، (بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لەئاین و بەرنامە و بۆچووندا، مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتییەوە".

ئیتر بەم شێوەیە "ڕووبەڕووبوونەوە" فیکرییەکان لەگەڵ بەرامبەردا لەجیهانی خۆرئاوادا وەك یەکەمین چەخماخە وابوون کە ڕێگای بیرکردنەوەی مکوڕانەیان بۆ ڕۆشن کردمەوە تا سەرلەنوێ چاوبخشێنمەوە بە خوێندنەوە ئاسایی و سادەکانمدا بۆ قورئانی پیرۆز کە ئەو خوێندنەوانەی پێشووم بەکاریگەریی ترسناکی ڕاهاتن و دووبارەکردنەوەی ڕۆژانە، سڕ بووبوون. ئەو دووانەش – ڕاهاتن و دووبارەکردنەوەی ڕۆژانە – زۆر لەو شتانەی لێ نەدیو کردبووین کە کەسی یەکەمی عەرەب هەستی پێکردووە و درکی پێکردووە کاتێك کە ئایەتەکانی سەرەتای قورئانی پێدەگەیشت کە بەدوای یەکدا دادەبەزینە سەر پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێبێت)، نوێگەرییەکەی دایدەچڵەکاند، سیستەم و دارشتنەکەی سەرسامی دەکرد، چونکە شتێکی تێدا دەبینی کە جیاوازتر بوو لەو شێوازانەی پێیڕاهاتبوو، جا ئەنجام ئەو سەراسیمەبوون و ئەو داچڵەکینە لەدەروونیدا وەردەچەرخا بۆ پرسیارێکی چارەنووسساز: چی لەدەوروبەرم دەگوزەرێت؟ کارەکە دوورتر و مەترسیدارترە لەوەی تەنها

شێوازێکی دیکەی تایبەتی نووسەرێکی تازەپێگەیشتوو و یان شاعیر و هۆنەرێکی بەرەولوتکەهەڵچوو یاخود کاهین و ئایندەبینێکی بانگەشەکار بێت.

هەوڵمداوە چەندێك بتوانم خوێنەر بەهێوری و لەسەرخۆییەوە ببەمە ناو ئەم نهێنییە قورئانییانەوە، ئەو گۆڕانکارییانە دیاربخەم کە قورئان لە بنیاتی زمانەوانییماندا کردوونی، جا بۆ ئەو شتە نوێیانە سەرەتا شیکردنەوەیەکی گشتی و وردی سروشت و جۆرەکانیم کردووە کە بەشی یەکەمی کتێبەکەی داگیرکردووە، نمونەی ئەو نوێگەرییانەشم لە سورەتە جۆربەجۆرەکانی قورئانی پیرۆزەوە وەرگرتووە، هاوکات لەگەڵ گرنگیدانێکی تایبەت لەزۆربەی بەشەکانیدا بە یەکێك لەو سورەتانەی کە زوویەزوو و سەرەتا دابەزیوە و زۆرترین و زووترین بەرکەوتنی تێدایە لەگەڵ نەریتە زمانەوانییە عەرەبییەکاندا، کە ئەویش سورەتی (الْمُدَّثِّر)ە، بەجۆرێك — لەگەڵ دیاردە گشتییەکانی سورەتەکانی دیکەی قورئاندا — زۆرترین بەشەکانی ئەم کتێبەیان لە لایەنە زمانەوانی و ڕێزمانی و ڕەوانبێژییە نوێگەرییەکانی ئەو سورەتەوە، ڕووماڵ کردووە و گرتوویەتییەوە.

پاشان بەشی دووەمی کتێبەکەم تەرخانکردووە بۆ جێبەجێکردنی ئەو دیاردانەی لەبەشی یەکەمدا باسمان کردوون، لەسەر سورەتەکانی قورئانی پیرۆز هەر یەکەیان بەجیا، بەوەیان دەستمپێکردووە کە زۆرترین خوێندنەوەی لەسەرزارمانە کە بریتیین لەسورەتە کورتەکان، بەسورەتی

(الفاتحة) دەستمپێکرد و پاشان پەڕیمەوە بۆ دواهەمین بیست سورەتی قورئان، لەسورەتی (النّاس) و پاشان (الْفَلَق) و پاشتر (الْإخلاص) و بەو جۆرە بەزنجیرەی پێچەوانەیی ڕیزبەندیی سورەتەکان توێژینەوەکەم ئاڕاستە کردووە.

لەگەڵ متمانەی تەواومان بە پێشەنگبوونی ئەم کارە کە دەستمانداوەتێ و لەپێشینەبوونی، بە خۆدەربازکردن لەکۆتوبەندی ئەو تاریکییە دوورودرێژە مێژووییەی بەسەر ڕاستییەتی نوێگەریی زمانەوانیی لەقورئانی پیرۆزدا دراوە، پێویستیشە بەردەوام جەخت لە ڕاستییەك بکەینەوە کە هیچ توێژەرێکی ژیرمەند نابێت پشتگوێی بخات ئەویش ئەوەیە: هەر لێکدانەوەیەکی مرۆیی، یان شیکردنەوەیەکی زمانەوانی بۆ قورئان، یاخود هەر دۆزینەوەیەکی ئیعجازییانەی ڕەوانبێژیی یان زمانەوانیی یان زانستیی لەقورئاندا، جا چەندێك شکڵ و شێواز (و ڕێوشوێن)ی بابەتییانەی گرتبێتەبەر، هەر لەسنوری بەپەسەندزانین (تەرجیح)دا دەمێنێتەوە و دەکەوێتە ژێر یاسای ئەگەرەکانی هەڵەی مرۆییەوە. هەرچییەکیش ئێمە لەم ڕێگەیەدا و لەمبارەوە دەیهێنین و باسی دەکەین هەمووی تەنها و تەنها هەوڵێکی دڵسۆزانەیە بۆ نزیکبوونەوە لەڕاستیی ڕەها، کە لەکۆتاییدا خۆمان دەستاوسان دەبینینەوە لەوەی بگەین پێی مادام ئێمە بەتوانا مرۆییە لاواز و کەمبڕ و سنوردارەکەمانەوە مامەڵە لەگەڵ ناکۆتا و بێسنوری ئیعجازی خواییدا دەکەین.

## ئیعجاز، یان تەنها بلیمەتیی و بەس؟

سەرەتا، پێویستە دانبەوەدا بنێم کە من لەقۆناغی سەرەتای ژیانمدا باوەڕم بەئیعجازی زمانەوانیی قورئان هەبوو، باوەڕێکی ڕیشەدار، پتەو، بەڵام بەوپێیەی کە مسوڵمان بووم و بەس، چونکە لەڕاستیدا توانای ئەوەم نەبوو بە ژیریی و عەقڵ درك بەو ئیعجازە بکەم و جیای بکەمەوە و بەو هۆکار و ئامرازە سەرەتاییانەی توێژینەوە کە لەبەردەستمدا بوون پەنجەی بخەمە سەر و دیاریی بکەم. بەڕاستی پێشتر لەزمانی قورئاندا جوانییەکی دڵگیر و سەرنجڕاکێش و ئەوپەڕی زمانپاراویی و وردیی دەستەواژە و ڕەوانبێژی و ڕێکئاوازیی (ڕیتم) و کەمەندکێشی و جیاوازبوونم دەدی، بەڵام ئەوکات درکم بەوە نەدەکرد کە ئەم تایبەتمەندییانە هەموویان شتێکن و ئیعجازی زمانەوانیی شتێکی دیکەی قووڵتر و گەیشتن پێی نارەحەتتر و شاراوەتر و ئەستەمترینە بۆ مرۆڤ. ئەوکات ئومێدم بەوە بەخۆم دەدا و دڵی خۆم بەوە خۆش دەکرد کە پاشئەوەی دەگەمە قۆناغێکی ڕۆشنبیریی و تێگەیشتنی زیاتری ئەوتۆ کە بەباشیی لەڕەوانبێژیی عەرەبی تێبگەم، ئیتر واملێدێت بەتواناتر بم بۆ دۆزینەوەی ئەو ئیعجازە قورئانییەی کە هیچ کام لەکتێبەکانی پێشینان نەیانتوانی بەشێوەیەکی زانستیی کە هەڵگری بەرپەرچدانەوە نەبێت، ڕازیم بکەن و قەناعەتم پێبکەن کە لەقورئانی پیرۆزدا هەیە.

بەڵێ وشەی "ئیعجاز"یان وەك ناونیشانی کتێبەکانیان داناوە، بەڵام تەنها باسیان لەڕەوانبێژی و ناوازەیی و جوانی و وردیی لەدەربڕیندا

کردووه، ئەمانەش هەموویان تایبەتمەندیی ئەوتۆن کە لەوانەیە، بەئاست و پلـــەی جیــاواز، لەئــەدەب و وێــژەی مرۆڤیشــدا هەرچــەندە زمــان و ڕەگەزیشــیان جیابێــت، ببیبیــنین. چــەندین بلیمــەت و قەڵەمبەدەســتی هەڵکەوتــە و زمانپــاراو و ژیرمەنــد هــەن کــە بەداهێنانــەکانیان جیهانیــان کەمەندکێش کردووە، دەروونەکانیان بە هونەرەکەیان سەراسیمە کردووە، بــەوەش بەهــەموو خاســیەت و تایبەتمەندییــەك پەســن دراون و نــاونراون، بەڵام بە ئیعجاز نا، (بــە ئیعجــاز وەســف نــەکراون). ئــەی بۆچــی سوورین لەســەر ئــەوەی کــە تــەنها قورئــانی پــیرۆز بــەم تایبەتمەندییــە نــاوبنێین و وەسف بکەین؟ ئەی ئیعجاز لــەکوێی قورئاندایــە ئەگــەر پێناســەی ئیعجــاز بریتی بێت لەوەی کە مرۆڤ توانای بەسەریدا ناشکێت؟. بەڵێ، ڕەنگە ئــەم لایەنانە هەموویان پێکەوە لەکۆتاییدا بڕژێنە دەریای ئیعجازەوە و قوڵتر و فــراوانتر و بــەپیتتر و دەوڵەمەنــدتری بکــەن، بــەڵام بــەپێوەری زانســتیی یەکلابووەوە دەتوانین بڵێین تەنها هەر خۆی بەس نییە بۆ پێکهێنانی ئــەو زەریا زەبەلاحەی کە ئێمە هەوڵ بۆ دۆزینەوە و سەلــماندنی دەدەین.

لەقۆناغی دواتری ژیان و توێژینەوەی زمانەوانییمدا، کە بەشــی زمــانی عەرەبیم تەواو کرد، هەمان پرسیار یەخەی گرتمــەوە، وەڵامەکەیشــم هــەر هەمان وەڵامی پێشوو بوو. پاشان ماستەر و دکتۆرام لەئەدەبی عەرەبیــدا بەدەستهێنا، جارێکی دیکە — بەجەختکردنەوە لەوەی کە دانی پێدادەنیم — خۆم بینییەوە دەستەوسانم لەبینینی ئیعجازی زمانــەوانیی لەقورئانــدا، بەوپێیــەی یــان بــا بڵــێین ســەرەڕای ئــەوەی کــە — بەلایــەنی کەمــەوە

لەدەروونی خۆمدا – بووبووم بە توێژەر و ڕەخنەگرێکی ئـەدەبیی پسـپۆڕ و ئەزموونـدار کـە دەسـتوپەنجەم لەگـەڵ ژانرەکـانی زمـان و ئەدەبـدا نەرمکردبوو.

هەروەها دانبەوەدا دەنێم کە لەپرۆسەی بەردەوامی گـەڕان و پشـکنین بـەدوای ئـەو ئیعجـازە ونبـووەدا، هەمیشـە ڕووبـەڕووی ئـەو گرێکـوێرە میتۆدییە قورسـە دەبوومـەوە: چـۆن لەناخمـدا گونجانێك دروسـت بکـەم لەنێوان مسوڵـمانێتی و توێژەربوونـدا، یـان بەگوزارشـتێکی زۆر سـادەتر: گونجان لەنێوان سۆزداریی ئاینی شایانمەندی وەرگرتن و ڕەتدانـەوە، کـە هەر بە زگماکیی چۆن بە تەواوی بـاوەڕی ڕەهـای بەئیسـلام و کتێبەکـەی هەیە ئاواش باوەڕی بـەئیعجاز هەیـە، لەگـەڵ شـیکردنەوەی زانسـتییانەی ڕەها کە شایانمەندی ڕەتکردنەوە نییـە و نـە سـۆزداری و نـە بـاوەڕ و نـە بۆچوونی تاکەکەسـی یـان بۆچـوونێکی ئامـادەی پێشـوەختە دروسـتکراو دەسـت لەبڕیارەکانییـەوە وەرنـادات؟ لەکوێـدا سـنوری بلیمـەتی، ئـەو بلیمەتییە جەلاتینییەی کە بەدەست ناگیرێت، دەوەستێت و کۆتاییدێت تا سـنوری ئیعجـازی ڕەهـا دەسـتپێبکات کـە هـیچ مشـتومڕ و ڕاڕاییـەك هەڵنـەگرێت لەبەرئـەوەی پشـت بەڕاسـتییە زانسـتییەکان دەبەسـتێت و بەزمانی ژمارە دەدوێت، بەوەش ئەو بڕیارانە، بڕیارگـەلی ئیعجـاز، نـە لـە بۆچوونی تاکەکەسی یان هەڵوێستی مرۆییانەی پـڕ هەڵچـوون و داچـوون، دەردەچـن، نــە لـە بەپەسـەندزانین و ئەگـەر و پێشـبینییە کەموکورتـە

مرۆییەکانیشەوە کە لەگەڵ کاتدا لەبڕیارەکانیاندا لەگۆڕاندان، بەڵکو ئەو بڕیارانەی ئیعجاز لەپێوەرێکی زانستیی ڕەهاوە دەردەچن.

هەموو ئەمانە پێش پێنانە قۆناغی سێهەمی تەمەنی زانستییمدا بوون، پێش ئەوەی ڕووبەڕووی پرسیارە سوور و سەرسامکەرەکە ببمەوە: ئیعجاز لە زمانی قورئانی پیرۆزدا لەکوێدایە؟ ئیعجاز بەمانای ڕاستەقینەی وشەکە، نەك بەمانای بلیمەتی و زمانپاراویی و تایبەتمەندیی و وردیی و جوانی، تۆ بڵێی وشەی "ئیعجاز" لەفەرهەنگی زمانەوانیی زەینماندا مانای بنەڕەتیی خۆی لەدەستدابێت و پاشەکشەی کردبێت بۆ مانایەکی زاراوەیی نویٚ کە یادگەمان لەگەڵیدا داننان بەمانای یەکەمی لەدەستدابێت و بەوەش لای ئێمە تەنهاوتەنها مانای زاڵ و سەرکەوتوو و تایبەتمەند یان بلیمەت بگەیەنێت؟

## ئیعجاز لای زانایانی پێشین:

زانایانی پێشین و نوێ بەمکوڕی و چڕوپڕی لەزۆر لایەنی ئەوەی ناویان ناوە "ئیعجازی قورئانی"یان کۆڵیوەتەوە، دەتوانم لە سێ لایەندا کورتی بکەمەوە:

**یەکەم: لایەنی جوانیی یان ڕەوانبێژیی:**

ئەم لایەنە بە ئاڕاستەی سەلماندنی ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لەزمان و داڕشتنەکەیدا پەرچوو و موعجیزەیەکی جوانییە. لە یەکەمینەکانی ئەو کەسانەی بەم ئاڕاستە و مانایە نووسیویانە (جاحظ) و (الرماني) و (الواسطي) و (ئەبو زەیدی بەلخی) و (ئەبو هیلالی عەسکەری) و (الخطابي) و (الباقلاني) و (قازی عەبدولجەبباری ئەسەدئابادی) و (عەبدولقاهیری جورجانی) و (ابن أبي الاصبع) و (ابن القيم الجوزية) و کەسانی دیکەشن. بەڵام جوانی، (الجمال) بابەتێکی ڕێژەییە و هەڵگری مشتومڕە و لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە و لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و لە زەمەن و کاتێکەوە بۆ زەمەن و کاتێکی دیکە شایانمەندی گۆڕانە. دەبێت دانبەوەشدا بنێین کە زمانەوانە خۆرئاواییەکان ئەگەر بەپێی پەیڕەوەکانی زانایانی ئێمەیان بکردایە بۆ سەلماندنی ئیعجازی زمانەوانیی قورئان، – لەوانەیە کەسیشیان لێ هەڵاوێر نەکەم – ئەوا ئەو کارەیان دەیبردن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە بلیمەتەکانی وەك (شکسپیر) یان (دانتی) یان (ڕۆسۆ) یان (گۆتە) ئەوانیش خواوەندن، چونکە ئەوانیش لەنووسینەکانیاندا جوانیی بەدیدەکرێت و هەیە.

**دووەم: لایەنی دەربڕین:**

ئەم لایەنـە بـە ئاڕاسـتەی سەلـماندنی ئەوەیـە کـە قورئـان پـەرچـوو و موعجیزەیەکی زمانەوانییە لەوردیی دەربڕین و گوزارشتەکانیدا، بۆئەوەش هەستاون بە باسکردنی جیاوازییە زمانەوانییە وردەکانی نێوان ئەو وشـە و داڕشـتە (ڕسـتە) و گوزارشـتانەی قورئـان کـە وادەردەکـەون هاوشـێوە و لەیەکچوو بن و هاوشێوەش نین، ئەو جۆرەی کە لای توێژەران بە (متشابە القـران) ناسـراوە. (الجـاحظ) لەکتێبەکەیـدا (البیـان والتبـیین) لـە یەکەمینەکانی ئەو زانایانە بوو کە باسی ئەم لایەنەی کردووە و بەدوایشیدا (قازی عەبدولجەببار) لە (متشابە القـران)دا و (الإسـكافي) لـە (درة التنزيـل وغرة التأويل)دا و (الرازي) لـە (درة التنزيـل) و (الكرمـاني) لـە(البرهـان في توجية متشابة القران)دا و کەسانی دیکەش، باسیان کردووە.

**سێهەم: لایەنی زانستی:**

ئەمەش لایەنێکە کە لە نووسراوی زانایاندا لەسـەردەمێکی زۆر زووەوە – بەپێچـەوانەی بۆچـوونی زۆر کەسـەوە کـە پێیانوایـە درەنـگ دەسـتیپێکردووە – سـەریهەڵداوە، زانایـانی پێشـین و بەدوایشـیاندا هاوچەرخ هەوڵیان داوە بیسلەمێنن قورئان بەو ڕاستییە گەردونییانەی کـە تێیدایـە و تـا سـەردەمە دوایینـەکان نەدۆزرابوونـەوە، پەرچـوو و موعجیزەیـەکی زانسـتییە. جـا ئـەم لایەنـە، ئەگـەر دووربێـت لـە بـەزۆر سەلـماندن و لەو پەیڕەوکارییە نازانستییانەی کە پێی زۆر کەسی لەوانـەی کـە لەبارەیـەوە دەنووسـن تێخـزاوە، ئـەوا لایەنێکـە کـە هـیچ گومانێـك

هەڵناگرێت و هیچ گومانکارێك ناتوانێت لەبەردەم ڕاستیبوونیدا گومانی هەبێت. بەڵام زۆربەی ئەوانەی کە لەمبارەوە نووسیویانە یان قسەیان تێدا کردووە، لە هاوچەرخان، بەداخەوە، وەك بڵێی گاڵتە بەخۆیان و بەخوێنەرانیان دەکەن و پێیانپێدەکەنن، چونکە نە پسپۆڕییەك لەئارادایە لەلایەنە ئیعجازییەکەی کە قسەی تێدا دەکەن، نە ئاڕاستەیەکی زانستی، نە بەڵگەهێنانەوە، نە ئاماژەکردنێکی زانستیی بۆ سەرچاوە خۆرئاواییەکانی ئەو بابەتەی کە توێژینەوەی تێدا دەکەن جا ئەو سەرچاوانە زاناکان بن یان گۆڤار یان ناوەندەکانی توێژینەوە. بەڕاستی لەوڕووەوە زانایانی پێشین تا ئاستێکی زۆر جێی سەرزەنشت نین لەوەدا کە ئاماژەیان بۆ ئەو سەرچاوە زانستییانە نەکردووە، بەڵام بەهەر جۆرێك بێت ئەوان زیاتر پەیڕەوکارانە کاریان کردووە لەچاو توێژەرانی هاوچەرخدا. ئەوکات عەرەب و مسوڵمانان کاروانچیی کاروانی زانست و دۆزینەوەکان بوون لەجیهاندا و ئەسپی ئەو بوارەیان تاودابوو، ئەوان سەرچاوەی یەکەم بوون بۆ سەلماندن یان ڕەتکردنەوە(ی ڕاستییە زانستییەکان)، ئەو کات ئەو سەردەمە بوو کە شارستانییەت لەڕاستەوە بۆ چەپ دەنووسرا. ئەوکات ئێمە قسەمان دەکرد و جیهان گوێبیست دەبوو، ئێمە دەمانوت و ئەوان دەیاننووسی، بەڵام شتەکە ئەمڕۆ بەتەواویی پێچەوانە بووەتەوە، ناوەندەکانی پرشنگدانەوەی زانستیی و سەرچاوەکانی دۆزینەوە و دروستکردنی بڕیاری زانستی گواستراوەتەوە بۆ کەرتەکەی دیکەی جیهان و شارستانییەت ئێستا لەچەپەوە بۆ ڕاست

دەنووسرێت. لەزانا لەپێشینەکان کە لەدەرگای ئیعجازی زانستییان دا: (الجاحظ – ٢٥٥ی کۆچی مردووە)، (ابن سراقة – ٤١٥ی کۆچی مردووە)، (الماوردي – ٤٥٠ی کۆچی مردووە)، (الغزالي – ٥٠٥ی کۆچی مردووە)، (القاضي عیاض – ٥٤٤ی کۆچی مردووە)، (فخرالدین الرازي – ٦٠٦ی کۆچی مردووە)، (ابن أبي الفضل المرسي – ٦٥٥ی کۆچی مردووە)، (داود الانطاکي – ١٠٠٨ی کۆچی مردووە). لەهاوچەرخانیش: (الاسکندراني – ١٨٨٩ی میلادیی مردووە)، (عبدالرحمن الکواکبي – ١٩٠٣ی میلادیی مردووە)، (طنطاوي جوهري – ١٩٤٠ی میلادیی مردووە). بزاوتی کتێبنووسین لەم بوارەدا لەسەدەی بیستەمدا گەشەی کرد و چالاك بوو، لەوانە زنجیرەیەك لەو کتێبانەی باسیان لە "ئیعجازی ژمارەیی" دەکرد لەقورئاندا، بەرکولەکەیان کتێبەکەی (عبدالرزاق نوفل) بوو: (ئیعجازی ژمارەیی لەقورئانی پیرۆزدا) کە لەسەرەتای ساڵانی حەفتادا بڵاوکرایەوە، چەندین لیستی بێکۆتای لە وشە "دووانەیی"ـەکان کە زمانی قورئانی پیرۆزی لەسەر بنیات نراوە، ریز کردبوو، ژمارەی وشەکانی (اللیل – شەو) هاوتایە بەژمارەی وشەکانی (النهار – ڕۆژ)، ژمارەی وشەکانی (الجنة – بەهەشت) هاوتایە بەژمارەی وشەکانی (النار – دۆزەخ)، ژمارەی وشەکانی (الملائکة – فریشتە) هاوتایە بەژمارەی وشەکانی (الشیاطین – جنۆکە)، تەنانەت ئەوەی دۆزیبوویەوە کە وشەی (شهر – مانگ) ١٢جار لەقورئاندا هاتووە، بەڵام وشەی (یوم – ڕۆژ) (٣٦٥) جار هاتووە. لەڕاستیدا ئیمام فەخری ڕازی یەکەم کەسە کە لەتەفسیرەکەیدا: (التفسیر

الكبير) ئامـاژەی بـۆ ئـەم نهێنییـە زمانەوانییـەی قورئـانی پـیرۆز کـردووە کاتێك کە دێتە سەر قسەکردن لەبارەی وشـەی (مَثَـانِيَ) لەئایـەتی (كِتَابًـا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ) (الزمر:٢٣). {التفسير الكبير: دار إحياء التراث العربي، بيروت، ٢٠٠١: ج٩، ل٤٤٦}.

هەرچـی پەیوەنـدیی بـەم کتێبـەی بەردەستتەوە هەیـە، ئـەوە، لـەناو هەموو ئەو کتێبانەدا کە لەسـەر ئیعجـازی قورئـان نووسـراون، ئـەم خـۆی بەتەنها دەبینێتەوە لەوەی باس‌وخواس لەوە بکات— کە نووسەر پێیوایـە – لایەنی ئیعجازی ڕاستەقینەی زمانی قورئانی پیرۆزە ئەویش بریتییە لـە نوێگـەریی ئـەم زمانـە، نوێگەرییـەك کـە لـەبوونی وشـەیەك لێـرەدا و گوزارشتێك لەوێدا، کورت نابێتەوە، بەڵکو ڕووماڵی زمانی قورئانی پـیرۆز هـەر لـە سـەرەتایەوە تـا کۆتـایی، لەئەلیفیـەوە تـا یـائی، بـە سـتونی و ئاسـۆیی، زمانـەوانی و ڕەوانبێـژیی، وەك وشـە و وەك ئـامراز و دارشـتە و گوزارشـت و قاڵـب و ڕێکئـاوازیی "ڕیـتم" و وێنـە و ڕوونکـاریی، دەکـات، هەموو ئەمانە بەچڕییەك کە ئەستەمە مرۆ نمونەی هاوشێوەی بێنێت یـان تەنانەت بتوانێـت نـزیکیش بێتـەوە لێـی، لەگـەڵ ئەمەشـدا هاوتـەریب بـە پارێزگاریکردن لەبنەماکانی زمانی عەرەبی و لەگەڵ تێگەیشتنی خەڵکیش لێـی، بـەڵکو سەراسـیمەبوونیان پێـی، سەراسـیمەبوونێك کـە هـەموو تێڕوانینێکی تێپەڕاندبێت.

## کاریگەریی شۆکی نوێگەریی لەسەر تاکی عەرەبی یەکەمین

ئەم زمانە نوێیە کە بەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی شێوازگەریی هەر لە وشە و دەربڕین و ڕێزمانی و وشەسازیی و ڕەوانکاریی، سەرەڕای لایەنی فیکرییدا دابەشبووە، مایەی سەرسامی و سەرسوڕمان بووە لای ئەو کەسانەی کە بۆ یەکەمجار گوێبیستی قورئان بوون، گوزارشتێکی کورتی قورئانیی سێ وشەیی وەك (فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ)، بەس بووە بۆئەوەی ئەو دەوارنشینە بلەرزێنێت و مووی لەشی گرژ بکات و شۆکی بکات کە بە ڕێککەوت گوێبیستی بووە و وایکردووە بڵێت: ئەمە چییە دەیبیستم!! ئەمە قسەی مرۆڤ نییە، پاشان کڕنووش ببات و بڵێت: "کڕنووشم بۆ زمانپاراویی و فەساحەتی ئەم قسانە برد". {الاتقان في علوم القران، السيوطي، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٣، ج٢، ل١٠٨}.

شتێکی پەنهانی نادیار لێرەدا ڕوودەدات کە گوێ هاوچەرخەکانی ئێمە توانای دۆزینەوە و ئاشکراکردنی نییە. گوێی عومەرمان لەکوێ بوو، یان گوێی ئەو کەسە دەوارنشینە، یاخود گوێی ئەو عەرەبانەی کە هەر بە بیستنی زمانی قورئانی پیرۆز مسوڵمان بوون، ئەمانەمان لەکوێ بوو تا بیگۆڕین بەم گوێیانەی خۆمان و بەوەش ئەو ئیعجازەی قورئانی پێ بدۆزینەوە کە ئەوان پێیان دۆزییەوە و هەست بەزمانەکەی بکەین وەك چۆن ئەوان هەستیان پێکرد، لەوەی کە ئێستا ئێمە دەستەوسانین کە بتوانین هەستی پێبکەین و پەنجەی بخەینەسەر؟! ئەو گوێیەمان لەکوێ بوو...!!

من هەمیشە لەنێوان خۆم و دەرونمدا دەمپرسی: ئەوەی کە قورئانی پیرۆز تەحەددای عەرەبی پێبکات تا هاوشێوەی قورئان بهێنن، ئەوە کارێکی کەمەندکێش و وروژێنە، بەڵام کارێکی واقیعبین و ژیرمەندانە و گونجاوە. پاشان کە تەحەددایان دەکات کە هاوشێوەی دە سورەتی قورئان بهێنن ئەوەش کارێکی سەرسامکەرە، نیگەرانکەرە، بەڵگەیەکی بەهێز و نائاساییە لەسەر متمانەی تەحەدداکار بەرامبەر تەحەدداکراو. بەڵام ئەوەی کە دوای ئەوە دوو جار تەحەددایان بکات و لە دوو سورەتی جیاواز و دوور لەیەك لەکاتی دابەزینیان: (البقرة و یونس) بەوەی کە (تاقە سورەتێکی هاوشێوەی) بهێنن، تاقە سورەتێك و بەس، ئا ئەمەیان زۆر زیاتر عەجیب و سەراسیمەهێنە، زیاترە لەوەی متمانەیەکی ئاساییانەی تەحەدداکار بێت بەرامبەر تەحەدداکراو. چی دەبوو ئەگەر بیانکردایە و گەورەپیاوانیان لەشاعیر و ئەدیب و وتاربێژ و زمانزان و بلیمەتانیان بۆ کۆبوونەوە گردببوونایەتەوە و بەیەکەوە هاوکاریی یەکیان بکردایە بۆ نووسینی تەنها سورەتێکی بچووك بەقەبارەی سورەتی (الضحی) یان ڕەنگە بەقەبارەی سورەتی (العصر) یاخود (الکوثر)، واتە بابەتەکە تەنها دانانی یەك دێرە نەزیاتر. ئاخۆ کارەکە تا ئەو ڕاددەیە قورس و گران دەبوو لەسەرشانیان؟ ئایا زمانەکە، زمانی خۆیان نەبوو و لەناویاندا ئەدیبانی ئەو زمانە و بلیمەتانی و شازادەی ڕەوانبێژییان هەڵنەکەوتبوو؟!
(ئەی بۆ نەیانکرد؟!)

## فقەبارەی ڕاستەقینەی ئیعجازیی نوێگەری

دانبـەوەدا دەنـێم ئەوکاتـەی خـۆم ئامـادەکرد بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەو پرسیارە، درکم بـە جـۆری ئـەو تەحـەددا و ئاڵنگارییـە نـەکرد و بڕیارمـدا زمـانی قورئـانی پـیرۆز داخڵـی تاقیگـە زمانەوانییەکـەم بکـەم و چـنین و تان‌وپۆکـەی بخەمـە ژێـر وردبینـەوە. پێشـتر هـەرگیز ئـەوەم بـۆ ڕوون نەبووبوویـەوە کـە لەپشـت هـەر ئایەتێکـەوە – بەمتمانـە و ڕوون و ئاشکراییەکی تەواوە ئەمە دەڵێم – بـەڵکو لەپشـت هـەر گوزارشـتێکەوە، تەنانەت خەریکە بڵێم: لەپشت هـەر وشـەیەکەوە، پەرچـوو و مـوعجیزە و "داهێنان"ێك هەیە، بەڵکو تـەنانەت لەزۆر کاتدا زیاتر لە یـەك داهێنـان، – داوای لێبوردن و مەعزەرەتم هەیە لای خـوای گـەورە کـە جگـە لـەم وشـە مرۆییـە کـەم‌وکورت لەدەربڕینـدا هـیچ شـك نابـەم لەزمانەکەمانـدا بـۆ گوزارشتکردن لەسروشتی ئیعجـاز، هەمیشـە نمونـەی بـاڵا بـۆ خودایـە –، بەوەش ملکەچانە سەرم نەوی کرد بۆ باڵایی ئاڵنگاری و تەحەددا ئیلاهییە پڕ داناییەکە.

ئـیتر هـەر لەوکاتـەوەی کـە ئـەو ڕاسـتییەم بـۆ دەرکـەوت، واملێهـات هەرکات نزیك دەبوومەوە لەزمانی قورئان بـۆ تـاوتوێکردنی و دۆزینـەوەی نهێنییەکانی، خۆم وەها دەهاتە پێش چاو کـە وەك بڵێـی شـکڵگۆڕاوێکی گـرگنم کـە دەیـەوێت هەڵشـاخێت بـە پەنجەیـەك لەپەنجـەکانی پێـی زەبەلاحێکی گەورەدا و پاشانیش ئەوەی بۆ ناکرێـت و بـۆی ناچێتەسـەر. ئەوەی لەم زمانەدایـە جۆرێـك نییـە لـەو دۆزینـەوە زانسـتییانەی کـە لـەم

سەردەمەدا ناسیمانن و زانیمانن و پێیانئاشنا بووین، بەڵکو شتگەلی نوێی زمانەوانیی سەرنجڕاکێش و گران و فرەنیشانە و فرەشێوەن، کە بەدوای یەکدا دێن و شوێن یەك دەکەون و هەندێکیان دەستی هەندێکی دیکەیان دەگرن و بەیەکەوە بەندن، بەجۆرێك ئەو کەسەی کە هەوڵی بۆ دەدات یان خۆی بۆ لاساییکردنەوەی ئامادەدەکات تووشی بێئومێدی دەبێت بەجۆرێك تەواو درك بەوە دەکات هیچ بوارێك بۆ ملەجەڕێ و ملبادان نییە.

بیهێنە بەرچاوی خۆت: ئەگەر باخچەیەکی جوانت هەبێت و هەموو ڕۆژێك پیاسە بکەیت بەناویدا و لێرە بۆنی گوڵێك بکەیت و لەولا خونچەیەکی تازە پشکوتو بدۆزیتەوە و لەم درەخت بەروبومێك لێبکەیتەوە و لەوی دیکە بەروبومێکی تام جیاواز بچڕیت، پاشان یەکێك بێت بۆلات و پێتبڵێت ئەو باخچەیەی کە تۆ چێژ لە بینینی دەیان شتی جوانی ناوی دەبینیت، هەزاران نهێنیی سەرسامکەری تێدایە کە لێت شاردراوەتەوە و قەت چاوت نەکەوتووەتە سەریان، هەرچەندە لێت نزیك بوون و لەبەردەستتدا بوون و لەبەرچاویشتدا بوون، پاشان هێندەی پێناچێت چاویلکەیەکت دەداتێ و دەیکەیتە چاوەکانت، کتوپڕ سەیردەکەیت لەبەردەم دیمەنێکدایت تەواو جیاواز لەوەی پێشتر پێی ڕاهاتبوویت: دەبینیت لەژێر هەر بەردێکی ناو باخچەکەدا مروارییەکی بەنرخ هەیە، لەنێوان هەر دوو گەڵای گوڵەکاندا پارچەیەکی ناسکی لە زیو دروستکراو هەیە، لەژێر توێکڵەداری هەر درەختێکدا گیراوەیەکی عەتری

ناوازه هەیە کە پێشتر نەتناسیوه و نەتزانیوه و پێیئاشنا نەبوویت، لەنێوان هەر دوو گەردی خۆڵی باخچەکەدا گەردێك لە کانزای بەبەها هەیە، و چەندانی دیکەش... ئەمانە هەمووی لەباخچەکەتدا بوون و تۆش نەتزانیوه !

جا هەموو کاری من لەم توێژینەوەیەدا بۆ دۆزینەوەی شتێکی وەك ئەو چاویلکە تایبەتەیە، ئەنجا دەستی خوێنەری قورئان بگرم تا بەم چاویلکە نوێیەی ڕزگاری بێت لەو ڕاهاتن و ئولفەتگرتنەی کە توانای بینینی ئیعجازی نوێگەریی لەقورئانەکەیدا، کوشتووه، و لەکاتی ڕووانینیدا بەو چاویلکە نوێیەی کتوپڕ بکەوێت بەسەر چەندان نهێنی و ڕاستیی زمانەوانیی و ڕەوانبێژیی بێسنوردا کە پێشتر هیچی لەبارەیەوه نەزانیوه.

## چڕێتیی ئیعجاز لە پێگە نوێگەرییەکاندا

بیرمدێت جارێك سەیری وێنەیەکی مەتەڵئاسای زنجیرە چیایەکی بەرز و نامۆم کرد کە لەسەیر و سەمەرەیی وترسناکیی دیمەنەکەیدا وا دەردەکەوت وێنەی ڕووی مانگ یاخود مەریخ بێت، بەڵام کاتێك کاغەزەکەم هەڵگێڕایەوه بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو مەتەڵە بخوێنمەوه شۆك بووم بەوەی کە ئەوە وێنەیەکی زۆر گەورەکراوی هێڵە وردەکانی پەنجەمۆری دەست زیاتر نییە. ئەمە ڕێك وەك ئەوەیە کە دواتر خوێنەر هەستی پێدەکات کاتێك سەیری نەخشەسازیی زمانی قورئان یان ئەوەی کە توانیومانە تا ئێستا لەوبارەوه بیدۆزینەوه، دەکات، ئەوەش لەڕێی هاوێنەی ئەو وردبینەوه کە ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات پێشکەشی خوێنەری بکات، ئەویش بەپشتبەستن

بەو وردبینە هەوڵ بدات ئەو ڕاستییە زانستییە سەرسامکەرانە لەقەبارەی سەرسامکەری خۆیاندا ببینێت.

ڕەنگە هەڵوێستەمان لەسەر یەکێك لەو ڕاستییانە کردبێت، بە دابڕکراوی لەڕاستییەکانی پێش خۆی و دوای خۆی، بەوەش شتەکەمان بە ئاسان سەیرکردبێت، بەکەمبایەخییەوە هەڵمانسەنگاندبێت، یان ڕەنگە لەدڵی خۆماندا وتبێتمانەوە: بەڵێ، بەڕاستی شتێکی نوێیە، بەس کەی نوێگەریی بووەتە ئیعجاز؟ ئەم ڕەخنەیەش ڕاستە، چونکە ئەگەر لەسەر یەك یان دوو یان سێ خاڵ لەم خاڵانە بوەستین و بەدابڕکراوی لەخاڵەکانی دیکە تاوتوێی بکەین، ئەوە بەڵێ هیچ ڕوویەکی ئیعجازیی نابینین. تەنها کاتێك چڕێتیی ئەو پێگانە دەدۆزینەوە کە ئایەت و سورەتەکانی پێ پڕکراوە لەم نوێگەرییانە و دەزانین چۆن بێ هیچ وەستان و بێ هیچ هەناسەدان و بێ هیچ حەسانەوە و بێ هیچ کەلێنێك یەك لەدوای یەك ئەو نوێگەرییانە بەدوای یەکدا دێن و هەروەها چۆن لەژێر هەر وشەیەك یان دارشتەیەك یان دەستەواژەیەکی قورئانیدا و لەژێر هەر دێڕ و لەپشت بەرگەکانیدا چۆن یەکێك یان دووان یان سیان و زیاتر لەسەرسوڕهێنەرەکانی نوێگەریی دەربڕین و شێوەکانی و ڕەنگەکانی، شاردراونەتەوە، جا ئەنجا ئەوکات درك بە سروشتی ئیعجازی زمانەوانیی قورئانی و ئەستەمبوونی بۆ لاساییکردنەوە یان ساختەکردن، دەکەین.

ڕەنگە بوترێت: جا هیچ شتێك ماوە لەجیهاندا قابیلی لاساییکردنەوە نەبێت؟ ئەوەتا دۆلار و دراوی ئیستەرلینی و یۆرۆ و زۆرینەی دراوە

جیهانییەکانیان ساختەکردووە، لاسایی پەیکەر و کەلەپور و ئەنتیکە و ستون و سککە و تابلۆ بەناوبانگەکانی گەورە هونەرمەندانی جیهانیان کردووەتەوە، ئیتر بڵێی دەستەوسان بن لەنووسینی سورەتێك یان دوو سوورەت، یاخود ئایەتێك یان دوو ئایەت؟ بەڵام جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەوەی شتێك ساختە بکەیت و بەسەر خەڵکدا تێپەڕێت، پاشان کەدوای ئەوە پێیانزانی سزای شایستەی خۆتت بدەن، بەڵام هێشتا لەدەروونیاندا ڕێز و سەرسامیی بەوردەکاری و بە هونەرەکەت دەرببڕن، لەگەڵ ئەوەدا کە شتێك ساختە بکەیت بەڵام لەلایەن خەڵکییەوە جگە لە گاڵتەجاڕی و بەسووکسەیرکردن و تۆمەتبارکردنت بە نەزانی و ناتازەگەریی و لاساییکردنەوە، هیچی دیکەت بۆ نەمێنێتەوە، ئا ئەمەیان ڕێك پشکی هەر کەسێك بووە کە هەوڵیدا بێت لاسایی زمانی قورئانی پیرۆز بکاتەوە.

## هەژموونی سەرسوڕهێنەرانەی بنیاتی نوێی ڕێکئاوازیی "ڕیتم" لای عەرەب

سروش (وەحی)، لای ئەو عەرەبانەی کە هاوزەمەنی دابەزینی بوون وەك دابەزین و نیشتنەوەی دەفرە فرپوێکی زەبەلاح وابوو لەبەرچاوی دەوارنشینانی سەرەتایی (ناپێشکەوتوودا)، بەهەموو ئاڵۆزییەکانی ئەو دەفرەفرپیوە و جادوویی دروستکردن و سەیروسەمەرەیی پارچە وردەکانی کەبەوردیی لەجێی خۆیان دانراون. لەهەموو ئەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە عەرەب، ڕاهاتبوون، وەك چۆن هەر میللەتێکی دیکە ڕادێن، لەسەرئەوەی کە هیچ ڕیتمێکی گوزارشت و دەربڕین جا چ هۆنراوە بێت یان پەخشان، قبوڵ نەکەن تەنها ئەو ڕیتمە نەبێت کە گوێیان پێیڕاهاتبوو لەقاڵب و دەستەواژە و داڕشتەی زمانەوانیی کە ئەمانە هەر ئەوەبوون کە لای نەوە دوای نەوەی نووسەران و وتاربێژان و شاعیرەکانیان هەبوون، جا ئەگەر کەسێکیان لەو ڕیتمە دەربچووایە هەستیان بە لادان و ناڕێکییەك دەکرد لە ڕیتمەکەدا بەجۆرێك گوێی ئازار دەدان، پاشان لەگەڵ ئەو لادان و ناڕێکییەی ڕیتمەکەدا ڕانەدەهاتن مەگەر بەتێپەڕبوونی ساڵان دووبارە بووایەتەوە تا پاشتر ببوایە بە ڕەگەزێکی دانپێدانراوی ناو یانەی ڕیتمە زمانەوانییەکەیان.

بەڵام ئەوان، ئای لەو سەرسامییە، هەستیان بەو ناڕێکی و لادانە نەکرد کاتێك بۆ یەکەمجار ڕووبەڕووی ئەو هورووژمە چڕەی نوێگەریی زمانەوانی و ڕێزمانی و گوزارشتکارییە یەکلەدوای یەکە بوونەوە کە لەقورئاندا هەبوو، کە دواتر لەدەروون و لەگوێیاندا و لەڕێی گردبوونەوە ئاوازە یەکلەدوای

یەکەکەی ئـەو نوێگەرییـەوە و بەخێراییـەکی بێوێنـە، فەرهەنگە ڕیتمییـە ناوازە و نوێکەی خۆیشی دامەزراند. بەپێچەوانەوە، ئـەوەی کـە لەسـاتە سەرەتاییەکانی دابەزینی قورئانـەوە ئـەوانی بـەرەو قورئـان کەمەنـدکێش کرد بریتی بوو لەڕیتمی زمانەکەی و مۆسـیقای وشـە و گوزارشـتەکانی، چ ناوخۆیی و چ دەرەکییەکانی، کە ئەمە لای تاکی عەرەب تەواو نوێ، بەڵام قبوڵکراو و بەڵکو خۆشەویسـت بـوو، بـەڵکو زیـاتر لـەوە سەراسـیمەکار و کەمەندکێش بوو تەنانەت بۆ ڕەوانبێژانی بێباوەڕان، کە ئەوان ئەوانە بوون کاتێك کە گوێبیسـتی دەبـوون هیچیان لەدەسـت نـەدەهات جگـە لـەوەی لەسەر زاری گەورەکەیان: وەلیدی کوڕی مـوغیرە – کـە لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕازی نەبوو مسوڵـمان ببێت – بڵێن:

سوێند بـەخوا پیاوێکتـان تێدا نییـە کـە لەشـیعر و هـۆنراوەدا لـە مـن شـارەزاتر بێــت، لــە مــن زیــاتر لــە ڕەجــەز و لەقەصــیدەی شــیعر و لەشیعرەکانی جننەکان شارەزاتر بێت، دە بەخوا ئەوەی ئـەو دەیڵێـت لـە هـیچ لەمانــە ناچــێ، دەبــەخوا ئــەم قسـانەی شــیرینییەکیان تێدایــە و گەشاوەیی جوانییەکیان بەسەرەوەیە، سەرەتا و کۆتاییەکەیشی پڕ لەخێر و کـەڵکی زۆرە، ئـەو بەسـەر هـەموو شـتێکدا بـەرزترە و هـیچ شـتێك لـەو بەرزتر نییە و هەرچییش لەژێریدا بێت تێکی دەشکێنێت. {رواه الحاكم في الـمستدرك} .

## گەشتەکەم لەئامێری زەمەندا:

چەندین جار لەنێوان خۆم و دەروونمدا ئەوەم پرسیوە: ئاخۆ بلێی ئامێرێك، دەزگایەك هەبێت بتوانێت لە گەردوونی کات و زەمەندا هەڵمبگرێت و بمباتەوە بۆ چواردە سەدە لەمەوپێش و بتوانم بەگوێی عەرەبی ئەو سەردەمە گوێبیستی قورئان ببم وەك بلێی ئەو چۆن بۆ یەکەمجار گوێبیستی بوو منیش ئاوەها گوێبیستی ببم؟ ئاخۆ دەتوانم خۆم دابماڵم لە یادگەی قورئانیی خۆم، بەڵکو تەنانەت لە یادگەی ئیسلامییم و خۆم وەها بێتە پێش چاو ئەو کەسەی سەردەمیی نەفامییم کە لەسەردەمی وەحییدا ژیاوە، و گوێی لەقورئان گرتووە کە ئایەت بەئایەت دابەزیوە و بەوەش گوێکانی ئایەتەکانی بەوشێوەیە وەرگرتووە کە هێشتا پاکن و دوورن لەڕاهاتن لەسەری و دووبارەکردنەوە و ئولفەت پێوەگرتن کە ئەمانە بەری بە بلیمەتیی ئەم گوزارشتە و نوێگەرییەکەی و ناوازەبوونەکەی گرتووە؟! الله... چ ئەزموونێکی خۆشە کە مسوڵمانانی سەرەتا گوزەراندوویانە کە وەحییان لەئاسمانەوە بەتازەیی و بۆ یەکەمجار پێگەیشتووە؟! چ خۆشییەك دایگرتبن کاتێك گوێبیستی بۆچوونی ئاسمان دەبوون لەهەموو کارێکدا کە لەژیانیاندا دەهاتەپێش و بەپەخشی ڕاستەوخۆ بڕیارە بێ مشتومڕ و بێ گومان و ڕاڕاییەکانی ئاسمانیان لەبارەی ڕووداوەکانی ڕۆژەوە وەردەگرت و بەوهۆیەشەوە بڕیارەکانی بێتاوانبوون یان سەرکۆنەکردن یان بەڵێن و هەڕەشەیان بۆ کەسانێك کە لەناویاندا دەژیان و لەبەردەم و لەبەرچاو و گوێیاندا دەهاتن

و دەچوون، دەبینی؟! بەڵکو دەبێت چۆن وتەکانی ئاسمانیان وەرگرتبێت کـە هـەموو ڕۆژێـك و هـەموو کاتوسـاتێك دەیبردنـە نـاو چـەندین بـڕی سەرسامکەر لەجیهانی جۆربەجۆر و ئەوتۆ کە خەریك بوو عەقڵ و ژیرییان توانای تێگەیشتنیانی نەبێت.

هـەوڵ بـدەن لەگەڵمـدا کاریگـەریی نمونـەی ئـەم ئایەتانـەی خـوارەوە لەسەر زەینی تاکی عەرەبی ئەو سەردەمە بهێننە بەرچاوی خۆتان کـە بـۆ یەکەمجار وەریاندەگرێت و گوێبیستیان دەبێت:

(وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّـاتٌ بِيَمِينِـهِ سُـبْحَانَهُ وَتَعَـالَى عَمَّـا يُشْـرِكُونَ (٦٧) وَنُفِـخَ فِـي الصُّـورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُـمْ قِيَـامٌ يَنْظُـرُونَ (٦٨) وَأَشْـرَقَتِ الْـأَرْضُ بِنُـورِ رَبِّهَـا وَوُضِـعَ الْكِتَـابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٦٩)).

لەوانەیە ئێستا لەم ئایەتانەدا و پاش تێپەڕبوونی چواردەسەدە بەسەر دابەزینیدا، جگە لە مانا سەراسیمەکەی کـە لەسـەروو توانـای خەیاڵدانی تاکی عەرەبی یەکەمەوە بـووە، بـەڵکو ڕەنگـە بـۆ تـاکی ناعـەرەبیش لـەو قۆناغە زووەی ئەوکات، جگە لە مانـا سەراسـیمەکەی هیچـی نەمابێتـەوە، جا دەبێت چۆن بێت ئەگەر ئەم مانایانە لە بەرگێکی نـوێی کەمەندکێشـدا بەچڕی و بەدوایەکداهاتنێکی گەورەتر لـەوەی کـە خەیاڵدانیشـی بەرگـەی بگرێت دابەزیبێت و پاشان تێکەڵ بەو نوێگەرییە زمانەوانییە سەراسیمەیە بووبێت کە تاکی عەرەبی ئەوکات پێی ئاشـنا نـەبووە، ئـەبێت ئەوکاتـە چ

کاریگەرییەکی دروستکردبێت؟ ئایا مرۆڤێك هەیە بتوانێت ئەو ساتە نوورانییانە بگێڕێتەوە و بیهێنێتەوە بەرچاو کە لەدەروونی مسوڵمانانی سەرەتادا ئەوەی تەقاندەوە کە تەقاندییەوە و ئەوەی دروستکرد کە دروستی کرد لە هێز و لەباوەڕ و لە متمانە و مکوڕبوون، بەوەش شارستانێتییەکیان بنیات نا کە ڕوو و ڕێڕەوی مێژووی گۆڕی؟

من پشتم بەو ئامێرە مرۆییە کەموکورتە بەست تاوەکو ئەو ساتانە بگێڕمەوە و بیانهێنمەوە بەر دیدە، لەکاتێکدا (سی دی)ی یادگەی قورئانیم لە کۆمپیوتەری مێشکمدا دەرهێنا، تا لەجێیدا (سی دی)ی یادگەی شیعری سەردەمی نەفامی (پێش ئیسلام) و بەدوایشیدا (سی دی)ی یادگەی فەرموودەکانی پێغەمبەر دابنێم، کە ئەم دووانە دوو نیمچە تاکە سەرچاوە و نیمچە جێی دڵنیایین بۆ پێکهێنانی وێنەیەك لەو زمانەی کە لەڕووی سەردەمەوە هاوتا یان هاوتەریبی زمانی قورئان بوون لەو چەرخەدا.

**لەنێوان فەرهەنگی قورئان و فەرهەنگی نەفامی ( پـێش ئیسـلام ) و فەرهـەنگی نەبەویدا :**

کاتێـــك کـــە لەهـــەوڵی دۆزینـــەوەی جیاوازییـــە زمانـــەوانی و شـێوازگەراییەکانی نێـوان قورئـانی پـیرۆز لەلایـەك و هەریـەك لەشـیعری سـەردەمی نـەفامی (پـێش ئیسـلام) و فـەرموودەی پێغەمبـەردا بم لەلایەکیترەوە، ئاساییە بەشێوەیەکی تایبەت گرنگیی بە شیعر بدەم، لای خۆم کەمێك زیاتر لە (بیست هەزار) دێڕە شیعر هەیە کە بە ئینسکلۆپیدیا ئەلکترۆنییەکانی بەردەستمان ژمـارەکراون، ئـەم قەبارەیـەش بەنزیکـەیی هاوتا یان زیاترە لەقەبارەی قورئانی پیرۆز، ئەگەرچی دەزانین ئەوەی لەم شیعری سـەردەمی نەمامییـە بـەپێی تێپـەڕبوونی کـات فـەوتاوە لەوانەیـە زیاتر بێت لەوەی لەبەردەستماندا ماوە. {لەم توێژینەوەیـەدا بـۆ شـیعری نەفامیی پێش ئیسلام پشتمان بەو (ئینسکلۆپیدیا شیعرییە) ئەلیکترۆنییە بەستووە کە سەنتەری ڕۆشـنبیریی لەدەوڵـەتی ئیمـارات ئـەنجامی داوە و سێ ئەپدەیتی هەیە: یەکەم:١٩٩٨، و دووەم:٢٠٠٠، و سێهەم:٢٠٠٣}.

لەڕاسـتیدا بـوونی کەسـایەتییەکی زمانـەوانیی تایبـەت بەشـیعری سەردەمی نـەفامی، جیـاواز لـە زمـانی پێغەمبـەری خـوا (سـەلامی خـوای لێبێت) کە خۆی لەناوچەرگـەی ئـەو سـەردەمە نەفامییـەدا لـەدایکبووە و ژیـاوە، هـەروەها بـوونی زمـانێکی پێغەمبەرانـەی تـەواو جیـاواز لـەزمانی کتێبێك کـە لەهـەمان سـەردەمدا سـەریهەڵداوە و پێغەمبـەری خـوا خـۆی پێیگەیاندووین، بەبێ ئەوەی ئەو سێ زمانـە کـەمترین تێکـەڵبوون تێکـەڵ

بین، ئا ئەمە خۆی بەڵگەیە لەسەر متمانەبوون بە دەقەکانی هەر سێ زمانەکە هەمووی: زمانی نەفامی، زمانی پێغەمبەرایەتی، زمانی قورئان، چونکە هیچ سەرچاوە شێوازگەرایی و زمانەوانییەکانی هیچ کام لەو سێ دەقە دزەی نەکردووەتە ناو دوو دەقەکەی دیکەوە. ئەمە لەکاتێکدایە درك دەکەیت بەوە کە شێوازگەلی شاعیرەکانی سەردەمی نەفامی بەجۆرێك لەیەك دەچن و بەناویەکدا چوون کە توێژەر ڕەنگە لەڕێی شێوازی نووسین یان کەسایەتییانەوە جیاوازییەکی تەواوەتیی لەنێوان شاعیرێك و شاعیرێکی دیکەدا بەدی نەکات. تەنانەت ئەگەر یەکێك لەو شاعیرانە لەوانی دیکە جیاوازتر و تایبەتمەندتر بێت لە بەهێزیی یان لاوازیی یان لەپاراویی زمانەکەی یاخود ناسکی یان سادەیی یاخود ناڕوونیدا، بەڵام هێشتا ڕەخنەگرێکی ئەدەبی بوێریی ئەوە ناکات لەبڕیارەکانیدا یەکلاببێتەوە لەوەی ئەو هۆنراوەیە پێویستە هی فلان شاعیر یان فلانی دیکە بێت، بەقەدەر ئەو بوێرییەی کە هەریەك لەئێمە جا ڕەخنەگر بین یان خوێنەرێکی ئاسایی، هەمانە کە دەتوانین یەکلاببینەوە لەوەی ئەم ڕستەیە قورئانە و ئەوەی دیکە قورئان نییە.

جا سەرەڕای ئەوەی کە زمانی فەرموودە دەبێت کاریگەر بووبێت بە زمانی قورئانی پیرۆز، کاریگەرییەکی ڕووکەشانە کە ڕەنگە لەزیاتر لە (٪١)ی دەقی فەرموودەی پێغەمبەر تێپەڕ نەکات، بەڵام ئەم کاریگەربوونە هیچی لەشێوازگەلی تایبەتی فەرموودەی پێغەمبەر نەگۆڕیوە، لەبەرئەوە زۆر پێویست بوو لەتوێژینەوەکەمدا سووربم لەسەر دەرخستنی جیاوازییە

شێوازگەرایی و زمانەوانییەکانی نێوان فەرموودەی شەریف و قورئانی پیرۆز، لەهەر شوێنێکدا بیدۆزمەوە، کە ئەوانە جیاوازیی ڕیشەیی و فراوانن، تا دەریانبخەم و ڕووی هەندێك خۆرهەڵاتناس و گومانکاری ئاڕاستە بکەم، لەوانەی کە ڕاهاتوون پەنجەی گومان بۆ زمانی وەحی درێژ بکەن و قسە لەسەر ئاسمانیبوونەکەی بکەن و پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێبێت) یان کەسانی دیکەی هاوچەرخی، بە دانان و نووسینی تۆمەتبار بکەن.

## شۆڕشە زمانەوانییە نوێیەکە:

ئایا عەرەبەکان چۆن ڕووبەڕووی زمانە نوێیەکەی قورئانی پیرۆز بوونەوە؟ لەکاتێکدا هەموو شتێکی بۆهێنابوون جگە لەو شێوازانەی کە پێیڕاهاتبوون لە وشە و داڕشتە و بنیاتی زمانەوانی، بەوەش ئەوانی خستە سەرسامییەوە و ڕەنگە هەر تووشی سەراسیمەبوونێکی کردبن کە تەنها بەتێپەڕبوونی کات و ڕاهاتن و ئولفەتگرتن لەگەڵ ئەو زمانە نوێیەدا ئەنجا ئەو سەراسیمەبوونە بەریدابن.

گۆڕانکارییەکە تەنها لەوشە قورئانییەکاندا کورت نەبووبوویەوە، بەڵکو ئەوەی تێپەڕاندبوو گەیشتبووە پەیوەندیی ئەو وشانە لەنێوان خۆیاندا، و پێگەیان لەناو ناوکۆ (سیاق)ـەکەیاندا و بەکارهێنانیان، هەروەها ئەو ڕەگەز و نەریتە زمانەوانی و ڕێزمانی و ئەندێشە نوێیانەی کە ڕێکیخستبوون، هەروابێتەوە ئەو یەکە زمانەوانییە تێروتەواوانەیش کە

لەکۆتاییدا لەو وشە و پەیوەندیی و نەریتانەوە پێکدەهاتن. جا ئەگەر لەسەر سورەتەکان یەك بەیەك هەڵوێستەمان کرد و زانیمان ژمارەی پێگە قورئانییە نوێیەکان و خاڵە ناوازە دۆزراوەکان لەهەر سورەتێکدا زیاترە لەژمارەی وشەکانی ئەو سورەتە و زانیمان کە لەسورەتێکی بچووکی وەك (الفاتحە)دا کە لە (٢٩ وشە) پێکهاتووە زیاتر لە لە(٥٨) "نوێگەری" تێدایە و لەسورەتی (الناس)دا (٢٠ وشە) (٣٣) "نوێگەری" و لەسورەتی (الفلق)دا (٢٣ وشە) (٣٨) "نوێگەری" و لەسورەتی (الآخلاص)دا (١٥ وشە) (٢٢) "نوێگەری" هەیە، هەرواش بۆ سەرجەم سورەتەکانی دیکە، ئەوا ئەوکات درك بە قەبارەی ئەو شۆکە دەکەین کە قورئان بە کەسایەتییە زمانەوانییە ناوازەکەیەوە، لە دەروونی عەرەبدا ئەوکاتە دروستی کردووە.

گومان لەوەدا نییە کە قورئان زمانێکی دیکەی سەربەخۆی جیاواز لەزمانی عەرەبی نەهێناوە، هەر ئەمەش خاڵی ئیعجازەکەیەتی، لەبەرئەوەی قورئان خۆی بە زمانی عەرەبی دابەزی و هەر لە ڕێزمانەکەی ئەوەوە دەستیپێکرد، بەڵام ناوازەبوونی لەوەدا بوو کە ئەو زمانەی تێپەڕاند و بازی بەسەر سنورداریی وشە و داڕشتە و قاڵب و وێنە و پەیوەندییە زمانەوانییەکانیدا دا، وەك دواتر دێت هەر لە پەرەپێدانی نەریتەکانی و پاشان ڕێزمانەکەی، بەبێ ڕەتکردنەوەی ئەو ڕێزمانە، هەروەها دەرگای لەبەردەم زمانەکەدا کردەوە بۆ گەشەکردن و

دەوڵەمەندبوون و بەخشینی ڕەهەند و ئاسۆگەلێکی بەرفراوان بەجۆرێك کە خاوەنانی ئەو زمانە هەرگیز خەونیشیان بەشتی وەهاوە نەبینیبوو.

ئیعجازی قورئـان لـەوەدا خـۆی نابینێتـەوە کـە زمـانێکی لـە هیچـەوە دروستکردبێت، ئەگەروابێت ئەوا خۆی و دروشم و یاساکانی لە مرۆڤەکان، جا هەر زمانێکیان هـەبێت، دادەبـڕان، بـەڵکو ئیعجازەکـەی لـە بنیاتنـانی زمانێکی نوێدایە لەسەر هەمان بنەماکانی زمانە کۆنەکە و پاشـئەوە فـڕین لە ئاسـۆگەلێکی فراوانـی ئـەوتۆدا کـە زمانـە کلاسـیکییەکە نەیناسـیوە و پێیئاشـنا نـەبووە یـان نەیگەیشـتووەتێ. زۆرجـار لـەکاتی وانەوتنەوەمـدا لەبابـەتی ئـەم توێژینەوەیـەدا ڕەخنـە و نـاڕەزایی ئـەوە لەلایـەن هەنـدێك لەئامادەبووانەوە ڕووبەڕووم کراوەتەوە کە دەستەواژەی "زمانێکی نـوێ" دەبڕم بەسەر زمـانی قورئانـدا، لەبەرئـەوەی بـەو ناونانـە وادەگەیـەنم کـە ئەوە زمانی عەرەبی نەبێت و زمانێکی ناعەرەبی بێت، پێشنیازی ئەوەیان کرد کە لەجیاتی ئـەوە دەسـتەواژەیەکی دیکـە بدۆزمـەوە و بـەکاریبهێنم، بەڵام لەڕاستیدا ئیعجاز لەم دژیەکییەدایە، دژیەکیی لەنێوان ئەو ڕاستییەی "کـە ئـەو زمانـە، زمـانی عەرەبییـە"، لەگـەڵ ئـەوەی کـە لەهەمانکاتـدا "زمـانێکی نـوێ"ش بێـت. ڕەنگـە ئەمـە نالۆژیکانـە دەربکـەوێت، بـەڵام لۆژیکی پەرچوو "موعجیزە" ئەوەیە کـە لەسـەر لۆژیـك بنیـات نـەنرابێت، کاتێك پەرچوو پشت بە لۆژیك ببەستێت ئیتر خۆ ئەوە پەرچوو نییە.

## کەسێتیی "سورەتەکان"ی قورئان:

پێشتر ئەوەمان زانی کە قورئانی پیرۆز فرمان(کردار)ی ناتەواوی (کَانَ)ی بەمانای (إنَّ - بەڕاستی) بەکارهێناوە. جا ئەم بەکارهێنانە نوێیە لەقورئاندا لەنزیکەی (١٩٠) جاردا دووبارە بووەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فرمانە بەمانا قورئانییە نوێیەکەی، تا ئێستا لەدەرەوەی قورئان بەکارنەهاتووە، تەنانەت لە فەرموودەی پیرۆزیشدا. بەڵام ئەوەی جێی سەرسامییە بریتییە لەسیستەمی دابەشکاریی ئەم کردارە بەسەر سەرجەم سورەتەکانی قورئاندا. شتێکی سادەیە پشکی سورەتێکی بچووکی دوودێڕیی وەك سورەتی (الاخلاص) لەو (١٩٠) جارەی دووبارەبوونەوەی ئەو کردارەدا تەنها یەك جار بێت، ئەوەش لەئایەتی (وَلَم يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)). کرداریی نەرێی (لم یکن) لەڕاستیدا مانای (هیچ هاوشان و هاوتا و هاوشێوەیەکی نییە نە لەڕابردوو نە ئێستا و نە لەئایندەدا)، واتە ماناکەی تەنها لە زەمەنی ڕابردوودا ناوەستێت وەك لەبەکارهێنانی مرۆیی ئێمەدا بەکاردەهێنرێت. جا بڵێی پێشبینیمان چۆن بێت لەوەدا کە پشکی سورەتێکی گەورەی وەك (البقرة) چەند بێت لەم کردارەدا، لەکاتێکدا قەبارەکەی بەنزیکەیی (١/١٢)ی قەبارەی هەموو قورئانە؟ هیچ! ئەی ئەو سورەتانەی دیکەی کە لەقەبارەدا بەدوای ئەودان؟ بۆنمونە (ال عمران)؟ هیچ! (المائدة)؟ هیچ! (الأنعام)؟ (الأعراف)؟ (الأنفال)؟ (التوبة)؟ هیچ، هیچ! بەمجۆرە تا سورەتی شازدەهەمین، واتە تا نزیکەی نیوەی

قورئان.. هەموو ئەم سورەتانە هیچ لەم بەکارهێنانە قورئانییە نویێ و سەیرەی ئەم کردارە ناتەواوە (الفعل الناقص)ـەی تێدا نییە.

بەڵام، لەناوەڕاستی ئەم ڕووبەرە فراوان و بەربڵاوەدا، کە هیچ شوێنەواری ئەم کردارە نوێیەی تێدا بەدیناکرێت، کتوپڕ سەرهەڵدەبڕین چاومان بە دیتنی باڵایەکی بەرز دەکەوێت کە سورەتی (النساء)ـە کە چوارەمینە لەڕیزبەندیی نێوان ئەو سورەتە گەورانەدا، کە ئەم کردارە بەشێوەیەکی دوور لە ڕێسا (٥٣) جار دووبارەبووەتەوە، بەڵام بەدوایدا ئەو کردارە ون دەبێت تا سورەتی (١٧)ـەهەمین کە سورەتی (الإسراء)ـە و بەچڕیی (٢٧)جار دووبارەبووەتەوە، بەدوایدا بەدرێژایی حەوت سورەتی یەکلەدوای یەك دیارنامێنێت و تا لەسورەتی ژمارە (٢٥)دا کە سورەتی (الفرقان)ـە باڵایەکی نوێی خۆی دەردەخات و (١١) جار دووبارە دەبێتەوە، ئەنجا جارێکی دیکە بەدرێژایی حەوت سورەتی دیکە ون دەبێتەوە تا لەسورەتی ژمارە (٣٣) کە سورەتی (الأحزاب)ـە سەرلەنوێ سەرهەڵدەداتەوە و (٢٦) جار دووبارە دەبێتەوە، دواتر لەچەند سورەتێکی دیکەی کۆتاییەکانی قورئاندا دەردەکەوێتەوە، ئەمەش پاڵپشتی ئەو بۆچوونەمان دەکات کە لەم توێژینەوەیەدا باسمان کردووە کە هەر سورەتێك لەسورەتەکانی قورئانی پیرۆز "قەڵا"یەکی بەهێز و پتەوی تایبەت بەخۆی و کەسایەتییەکی زمانەوانیی سەربەخۆی هەیە کە بەجۆرێك لەسورەتەکانی دیکەی جیادەکاتەوە کە قورس بێت ئایەتەکانی سورەتەکان تێکەڵ بن یان هەندێکیان بچنە ناو هەندێکی دیکەیانەوە.

جا لەوە گرنگتر لەم دیاردەیەدا ئەوەیە ئەم دیاردەیە وەك بڕوانامەیەکی بەڵگەنامەیی وەهایە بۆ هەر سورەتێك کە بووەتە پاڵپشت و پشتگیرییەك بۆی لەو ڕیزبەندییەی ئێستایدا لەناو سورەتەکانی دیکەدا، واتە پشتگیریکەری پێگەی هەر سورەتێکە لەناو ڕیزبەندیی سورەتەکانی قورئاندا، هەروەها نکوڵیی لە ڕوودانی هەر شڵەژان (ناڕێکی) یاخود دەستوەردان و دەستکارییەکی مرۆیی دەکات لەو ڕیزبەندییەدا کە وەك ئەوەی لەبەردەستماندایە هەروا هاتووە بێ دەستکاری. ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەکرێت تای تەرازووی ئەو کەسانە قورس بکات کە دەڵێن ڕیزبەندیی ئێستای قورئان بەفەرمانی ئاسمانیی دانراوە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە جەختکردنەوەیە لەسەر بەردەوامیی ئەو ڕیزبەندییە وەك خۆی بەدرێژایی کات و بێدەستکاری ماوەتەوە هەروەك ئەوکاتەی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا دانراوە، بەپێچەوانەی بانگەشەی هەندێك خۆرهەڵاتناس و خەووخەیاڵاتە نابابەتییەکانیان.

هەروەها کەسایەتیی زمانەوانیی سورەتەکانی قورئان، هەر سورەتێکی بەجیا، ئەمەش دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەرە لەقورئاندا، بەشێکیشە لەپەیکەر و چوارچێوەی گشتیی کەسایەتیی زمانەوانیی ئەو کتێبە پیرۆزە. بەڕاستی هەر سورەتێك، وەك لەتوێژینەوە وردەکارییەکەی سورەتەکاندا خستوومانەتەڕوو، بە چەند وشەیەك جیادەکرێتەوە کە لە سورەتەکانی دیکەدا نین، هەروەها بە پەیوەندیی زمانەوانیی نوێ و قاڵب و داڕشتە و ئامڕازگەلی ئەوتۆ جیادەکرێتەوە کە تەنها لەو سورەتەدا هەیە

و لەسورەتەکانی دیکەدا نین، ئەمە جگە لە تایبەتمەندیی ڕیتمی گشتی و کۆتایی یان لەسەروەستانی ئایەتەکان کە ئەم دووانە هەر سورەتێکیان ڕێکخستووە تا دەگاتە ئەوەی کە خەریکە هەر سورەتێك بەو دوو تایبەتمەندییە: ڕیتمی گشتی و سەروەستانی ئایەتەکان، ببێتە سورەتێکی سەربەخۆ و جیا لەزۆرینەی سورەتەکانی دیکە.

## ئایا کەسێتیی سورەتەکان تێکەڵ یەك دەبن؟

زۆرجار کاتێك دیقەتی هەندێك سورەت دەدەین و دەیخەینە بەر باس، بەتایبەتی سورەتە کورتەکان، هەستدەکەین خەریکە لەهێڵی سورەتەکە بترازێین و خوێندنەوەکەمان بمانگۆڕێت و بمانبات بەرەو سورەتێکی دیکە کە لە پیتی کۆتایی ئایەتەکانیدا و لەڕیتمیدا لەیەك دەچن، یاخود ڕیتمی هەندێك قاڵبیان نزیکن لەیەکەوە، وەك چۆن بۆ نمونە لەکاتی خوێندنی هەردوو سورەتی (المرسلات) و (النازعات)دا هەستمان پێکردووە، یان لەنێوان سورەتەکانی (التکویر) و (الانشقاق)، یاخود (الاعلی) و (اللیل)دا. جا ئەم جۆرە خزان و دەرچوونە لە هێڵی سورەتەکە وامانلێدەکات گومان ببەین ئەمە، چوونەناویەك و تێکەڵبوونی کەسایەتیی هەردوو سورەتەکەیە و ونبوونی سنوری نێوانیانە تا ئاستی گونجاویی توانەوەی یەکێکیان لەوی دیکەیاندا، بەوەش قسەکەی ئێمە لەبارەی سەربەخۆیی هەر سورەتێك لە کەسایەتییە زمانەوانییەکەی و جیاوازبوونی لەسورەتەکانی دیکەی قورئان، هەڵدەوەشێتەوە.

### لەنێوان هەردوو سورەتی (الاعلى) و (الليل)دا:

بەڕاستی هەر بە بەراوردێکی خێرای نێوان هەردوودانەیەك لەم سورەتانەی باسمان کردن، بۆمان دەسەلمێت کە چۆن هەردوو کەسایەتییە زمانەوانییەکەی دوو سورەتەکە لەیەك دوور دەکەونەوە بەجۆرێك کە تەنانەت خەریکە بە تاقە یەك دەستەواژەش بەریەك نەکەون و لەیەك نەچن. جا با بۆ نمونە لەبەردەم هەردوو سورەتی (الاعلى) و (الليل)دا هەڵوێستە بکەین تا یەك لایەنی ئەو ڕووبەرە زمانەوانییە وەربگرین کە لەو دوو سورەتەدایە، ئەویش لایەنی داڕشتە و گوزارشتەکانە، تا لەڕێی ئەمانەوە ئەوە ڕوون بکەینەوە تا چەندێك هەردوو کەسایەتیی زمانەوانیی هەردوو سورەتەکە لەیەك دەچن یان لەیەك جیاوازن، سەرەڕای تێکەڵبوون و بەناویەکداچوونی هێڵی ڕیتمی نێوانیان وەك باسمان کرد.

سورەتی یەکەمینیان لە (٧٢) وشە و دووەمینیان لە(٧١) وشە پێکدێت، جا سەرەڕای وەکیەکبوونی کۆتایی ئایەتەکان (ڕیتمی کۆتا وشەی هەر ئایەتێك) لەنێوان هەردوو سورەتەکەدا، کە هەمیشە بە پیتی (ئەلف) کۆتایی دێت و زۆربەی جار لەسەر وەزنی (فعْلَى) هاتوون، هەروەها سەرەڕای ئەوەی هەردوو سورەتەکە لەهەندێك وشەی دیاریکراودا هاوبەشن و لەهەردووکیاندا هاتوون وەك (خلق – الأشقى – يَصْلَى – الآخرة – ربّه – الأعلى)، جگە لەمانە، ئەو دوو سورەتە لەهیچ گوزارشتێك یان داڕشتەیەکدا هاوبەش نین، هەریەکەیان گوزارشت و داڕشتەی

سەربەخۆی خۆی و تەواو جیاواز لەسورەتەکەی دیکەی، هەیە. لەوەش سەیرتر، بەڵکو خاوەن ئیعجازتر ئەوەیە کە زۆرینەی ئەو داڕشتە و گوزارشتانەی کە هەر یەك لەو دوو سورەتەی لێ پێکهاتووە، تەنها و تەنها تایبەتن بەو سورەتە و لەهیچ سورەتێکی دیکەی قورئاندا نین.

لەناو (٢٦) داڕشتە یان گوزارشتدا کە کۆڵەکەی سورەتی (الأعلى)یە، دەتوانین تەنها چوار دانەیان لە سورەتەکانی دیکەی قورئاندا بدۆزینەوە کە ئەمانەن: (خَلَقَ فَسَوَّى – إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ – فَذَكِّرْ – وَلَا يَحْيَا)، لەکاتێکدا (٢٢) داڕشتەی دیکەی سورەتەکە، واتە زیاتر لە(٨٠٪)ی داڕشتە و گوزارشتەکانی، تایبەتن بەم سورەتە خۆی و لەهیچ شوێنێکی دیکەی قورئاندا دووبارە نەبوونەتەوە.

هەرچی پەیوەندیی بە سورەتی (الليل)ـەوە هەیە، ئەوا لەنێوان (٢٥) داڕشتە و گوزارشتدا، کە کۆڵەکەی پێکهاتنی سورەتەکەن، دەتوانین تەنها (سێ) گوزارشتیان و بەس بدۆزینەوە کە لەسورەتەکانی دیکەی قورئانی پیرۆزدا هاتوون، ئەوانیش (فَأَنْذَرْتُكُمْ – كَذَّبَ وَتَوَلَّى – إِلَّا ابْتِغَاءَ)، دوای ئەوە (٢٢) داڕشتە یان گوزارشت کە دەکاتە (٨٨٪)ی داڕشتە و گوزارشتەکانی سورەتەکە، تەنها لەم سورەتەدا هەن و هیچ سورەتێکی دیکە لەمەدا هاوبەشی ئەم سورەتە نییە، بێگومان بە سورەتی (الاعلى)ـشەوە.

## کەسێتیی تاقانەیی قورئان:

فیترەتی عەرەب هەر لەیەکەم ساتی دابەزینی سروش (وەحی)ـیەوە درکی بەوە کرد کە هەرچییەك پەیوەندیی بە قورئانی پیرۆزەوە هەیە، ئاماژە بۆ نوێگەریی و تایبەتمەندیی دەکات، هەر لە ناوە تایبەتەکەیەوە (قُرآن) کە عەرەب پێش ئیسلام هەرگیز ئەم وشەیەی بەو شێوە داڕێژراوە نەناسیبوو و پێی ئاشنا نەبوو، وەك بڵێی بە بێوێنەبوونی وشەکەی ئاماژە بۆ بێوێنەبوونی ناوەرۆکەکەیشی دەکات. پاشان بەو ناوە تایبەت و جیاوازەی پێشەکیی کتێبەکە: (الفاتحة) کە هیچ کتێبێکی دیکە لەو خاڵەدا هاوشێوە و هاوبەشی قورئان نەبووە، هەروابێتەوە وشەی تایبەتی "السورة" "سورەت" کە دەروازە یان بەشەکانی پێ ناونراوە، کە ناوەکە لە (السور)ـەوە وەرگیراوە کە مانای ئەو دیوارە دەگەیەنێت کە چواردەوری شار یان قەڵایەکی داوە بۆ پاراستنی، وەك بڵێی ئەوە ئاماژەیەکی ئاسمانیی زووبەزووە بۆ پارێزبەندیی "سورەتەکان"ی قورئان و ئەستەمبوونی لەبەردەم هەر کەسێکدا کە بیەوێت لاسایی بکاتەوە یاخود لەو دیوارە پتەوانەوە بتوانێت کەلێنێك بدۆزێتەوە کە لێیەوە دزە بکاتە ناوەوەی. دواتر وشەی تایبەتی (آیَة) (ئایەت)، کە بەمانای پەرچوو "موعجیزە" دێت، خوای باڵادەست ئەو ناوەی ناوە لەو یەکەم یەکە زمانەوانییە بچووکانەی قورئان، ئەمەش هەر ئاماژەیەکی ئاسمانیی دیکەیە بۆ جەختکردنەوە لە خاسیەتی ئیعجازیی و ڕەگەزیی ئاڵنگاریی هەر یەکەیەکی زمانەوانیی تیایدا، جا ئەو یەکە زمانەوانییە کورت بێت

یاخود درێژ. پاشان شتێکیتر و کۆتایی ئەوەیە کە قورئان بە وشەی (یَتْلُو) یـان (تـِلاوة) تایبـەت کـراوە و ئـەم دوو وشـەیە تایبـەتن بەخوێندنـەوەی قورئانی پیرۆز و بۆ خوێندنەوەیتر بەکارناهێنرێن، وەك بڵێـی ئامـاژەیـەکی بەڵگـەدارە لەئاسمانـەوە کـە: پێغەمبـەری خـوا (سـەلامی خـوای لێبێـت) یەکەم کەس نییە لەسەر زەویدا کە ئەم ئایەتانە دەخوێنێتەوە، بەڵکو ئەو "(تالٍ) خوێنەرەوە"یـە یـان "(ثـانٍ) دووەمـە" لەخوێندنەوەیدا، چـونکە جبریل یەکەم کەس بوو کە خوێندییـەوە و پێغەمبـەریش سـەلامی خـوای لێبێت بەدوای ئەودا و شوێن خوێندنەوەکەی ئەو کەوت.

زۆر گرنگە جەخت لەو ڕاستییە بکەینەوە کە قورئانی پیرۆز لەمێـژووی کتێبدا لەجیهاندا تاکە کتێبێکە کە بێوێنـە و تاقانەیـە و جیادەبێتـەوە بـە بوونی چەندین تایبەتمەندیی کە هیچ کتێبێکی دیکە لەو خاڵەدا هاوبەشـی قورئان نییە، وە هەرواش دەمێنێتەوە. بەراوردەکە لێرەدا لەنێوان بابەتی کتێبەکان یان بیرۆکەکەیان یان زمانەکـەیان یـاخود شـێوازەکەیاندا نییـە، چونکە گومان لەوەدا نییـە هـەموو کتێبێـك تایبەتمەنـدیی ئـەوتۆی خـۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لەسـەرجەم کتێبـەکانی دی لـەو لایەنانـەوە کـە باسمان کردن، بەڵام لێرەدا قسەکەی من لەسەر "جنس"ی کتێبە، لەسەر ڕەگەزی کتێبە بەوپێیەی کە کتێبە.

ئەگـەر بـەراوردێك بکـەن – بۆنمونـە– لـەنێوان ئـەم کتێبـەی ئێسـتا لەبەردەستدایە لەگـەڵ هـەر کتێبێکـی دیکـەی نـاو کتێبخانەکەتانـدا هـیچ شتێك نابیننەوە ئەم کتێبە لەکتێبەکانی دیکە جیابکاتـەوە –بـەو پێیـەی

کتێبە – تەنها ئەگەر بەراوردی بکەین بە کتێبێك کە بەزمانی ئینگلیزی نووسرابێت ئەوکات دەتوانین بڵێین ئەوەی کە یەکێك لەم دوو کتێبە جیادەکاتەوە دوو شتە: ئەوەی یەکەمیان بە زمانی عەرەبی نووسراوە (و وەرگێڕدراوە بۆ کوردی) و دووەمیشیان بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە، هەروەها ئەوەی کە یەکەمیان لەلای ڕاستەوە بۆ چەپ دەخوێنرێتەوە و دووەمیان لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاست. ئەمە هەموو جیاوازیی نێوان ئەو دوو کتێبەیە، بەڵام لەگەڵ ئاگاداربوون لەوەی کە هەریەك لەو دوو کتێبەش لەو خاسیەتەدا لەسەرجەم کتێبەکانی دیکە جیاناکرێتەوە، لەبەرئەوەی جگە لەم کتێبە ملیۆنان کتێب هەن بەزمانی عەرەبی نووسراون و جگە لەو کتێبەش ملیۆنان کتێب هەن بەزمانی ئینگلیزی نووسراون. جا ئالەم ڕووانگەوە دەبینین کە قورئانی پیرۆز چەند تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی هەیە کە هیچ کتێبێکی دیکە لەپێش خۆی و دوای خۆیشی تیایدا هاوبەشیی ناکەن و لەم ناچن، کە چەند دانەیەك لەو تایبەتمەندییانەمان ژماردووە، لەوانە:

- ئەو ناوانەی تایبەتن بە قورئان و بە سورەت و ئایەتەکانی.

- بەزیاتر لە شێوەیەك دەخوێنرێنەوە و هەموویشی لەئاسمانەوە دابەزیون.

- جیاوازیی خوێندنەوەی قورئان لەنووسینەکەی (وەك نووسینی وشەکانی "الصلاة و الزكاة و الحياة" بە واو "الصلوة الزكوة الحيوة") لەکاتێکدا بە ئەلف دەیانخوێنینەوە، یان وەك خوێندنەوەمان بۆ وشەی

(قَـوَارِيرَا)، لەئايـەتی ١٦ی سـورەتی (الإنسـان) بـەبێ ئـەلف لەکاتێکـدا ئەلفەکە لەنووسیندا هەیە و نووسراوە.

- جیاوازیی دەربڕینەکەی لە دەربڕینی هـەر دەقێکی دیکـەی عـەرەبی (زانستی جوانخوێندنەوەی قورئان — التجوید).

- جیاوازیی ڕێنووسی قورئان لەنووسینی هەر دەقێکی دیکەی عەرەبی.

ـــ بەمـــەرجگرتنی گوێبیســـتبوونی لەمـــەرجی جوانخوێندنەوەیـــدا، (پێویستە سەرباقی زانستی تەجوید پشت بەگوێبیستبوونی و گێڕانـەوەی زارەکیی ببەسترێت کە زنجیرێکـی نەپچـڕاوە و قوتـابی لەمامۆسـتاکەیەوە وەریدەگرێت تا زنجیرەکە دەگاتەوە بە پێغەمبەری خوا خۆی).

ــ خوێندنـەوەی بـەدەنگی خۆشـەوە. ("بـەدەنگی خۆشـەوە قورئـان بخوێننەوە، ئەوە لەئێمە نییە کە قورئان بەدەنگی خۆش نەخوێنێتەوە").

- جیاوازیی تەواوەتیی شێوازی قورئان لە شێوازی قسەی ئەو کەسـەی کە پێیگەیاندووین (کە پێغەمبەرە سەلامی خوای لێبێت).

- ملیۆنان کەس لەبەرگەوە بۆ بەرگ لەبەریانە.

ــ زۆرینـەی ئەوانـەی کـە قورئانیـان لەبـەرە لـەو کەسـانەن کـە لـە ئاخێوەران (قسەکەران)ی زمانەکەی نین، (زۆربەی ئەوانەی کە قورئانیـان لەبەرە لەوکەسانەن کە بەعەرەبی نادوێن و لێی تێناگەن، عەرەب جگە لە ٢٠٪ی مسوڵمانانی جیهان زیاتر نین).

ــ دەقەکـەی، ڕۆژانـە ملیۆنـان جـار ڕاسـتاندن و پێداچـوونەوەی بـۆ دەکرێت، واتە: (بەئاشکرا و دەنگی بەرز دەقەکەی دەخوێنرێتەوە، پاشان

ڕاستاندن دەکرێت، بەشێوەی بەکۆمەڵ و لەبەردەم جەماوەری جیاواز و دوورمەودای نوێژخوێنان هەموو ڕۆژێك سێ جار: بەیانی، ئێوارە، خەوتنان، جگە لەنوێژی هەینی و هەردوو نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانیش، ئەمەش لە ملیۆنان مزگەوت و لەسەر هەموو ڕووی گۆی زەوی ئەنجام دەدرێت، بەدرێژایی چواردە سەدە لەو ڕۆژەوەی کە فەرمانی نوێژکردن دابەزیوە تا ئەمڕۆ بەو شێوە کراوە، جا هەرکاتێك پێشنوێژ هەڵەی کرد لە خوێندنەوەی وشەیەك یان پیتێك لەقورئاندا، دەیان نوێژخوێن کە لەپشتییەوە نوێژ دەکەن دەستبەجێ ئاگاداری دەکەنەوە و هەڵەکەی ڕاست دەکەنەوە، جا لەگەڵ ئەم سیستەمە بەڵگەکارییە سەرسوڕهێنەر و چڕەدا بەدرێژایی سەدە و دووریی مەوداکان ئەستەمە هیچ وشەیەك یان دەستەواژەیەك یان خوێندنەوەیەکی ئەو قورئانە زیادبکرێت یان لابرێت یان دەستکاریی بکرێت).

- فراوانترین شۆڕشی زانستیی لەکات و زەمەنێکی پێوانەییدا بەرپاکرد (ڕووینەداوە کتێبێك، جگە لەقورئان، شۆڕشێکی ئەدەبی و زانستی و فیکریی و زمانەوانیی لەهەموو ئاڕاستەکانەوە و لەسەردەمێکی چەند ساڵەیی کەمدا و لەدوورگەیەکی نەخوێندەواری گۆشەگیردا بەدیهێنابێت کە پێشتر تەنها یەك کتێبی ناسیبێت کە ئەویش کتێبی پیرۆز بووە).

## قاڵبە زمانەوانییە نوێیەکان:

عەرەبەکان ئاشنای دیاردەیەکی زمانەوانیی بوون و کاریان پێکردووە کە سەیر و نامۆ نەبووە بۆ زمانەکانی دیکەش، ئەویش ئەوەبووە کە فەرهەنگێك لە بنیاتی زمانەوانییان هەبووە لەناو شاعیرەکانی سەردەمی نەفامیی پێش ئیسلامدا باوبووە و بەکاریانهێناوە کە لێیەوە کەرەستە شیعرییەکانی خۆیان وەرگرتووە بۆ گوزارشتکردن لەبیروبۆچوونەکانیان و پاشان ڕەنگە هەرگیز لەو فەرهەنگە لایان نەدابێت، بەجۆرێك لەو فەرهەنگەوە چەندین قاڵبی جێگیریان پێکهێناوە کە بناغەی تان‌وپۆ زمانەوانییەکەی زۆرینەی شیعرەکانیانی پێکهێناوە. دەتوانین زۆرینەی ئەوەی لەبەردەستماندایە لەشیعری سەردەمی نەفامیی پێش ئیسلام بیگێڕینەوە بۆ چەند دە دانەیەك قاڵبێکی زمانەوانیی بنەڕەتی کە لەبازاڕی شیعربازییدا تا سەردەمی دابەزینی قورئانی پیرۆز باو بوون و بەکارهاتوون، ئەم قاڵبانە ژێرخانی بنیاتی زمانەوانیی شیعریان پێکهێناوە. زۆر لەم قاڵبانە تا دوای قورئانیش بەردەوام بوون، تا ئێستاش هەندێکیان لای زۆر لەشاعیرەکان هەر زیندوون و بەکاردەهێنرێن، بەڵام بەجیاوازیی لەڕێژەی بەکارهێنانیان لای هەریەکەیان. هەروەها ئەم قاڵبانە وەك یەکە یان داڕشتەی زمانەوانیی سەرەتایی وەهابوون کە بنیاتی زمانەوانیی گشتیی هۆنراوەکە یان دەقە ئەدەبییەکانی لەسەر بنیات نراوە، زۆر دەگمەن بووە شاعیرێك یان نووسەرێك یان وتاربێژێك لەو قاڵبانە دەرچووبێت و لای دابێت یاخود

قـاڵبێکی دیکـەی زیادکردبێـت کـە لەبنیاتـە زمانەوانییـە کۆنەکـەدا جێـی گرتبێت.

بەڕاستی ئەم قاڵبانە لای خـەڵکی سـەردەمی نـەفامیی پـێش ئیسـلام، وەك پارچە کارتۆنەکانی (جیگ سۆ) یان کاغەزی یاری وەهـابوون، ئـەوان چـەندین پارچـەی ئامـادەکراو لەبەردەسـتیاندا بـووە بـۆ یـارییپێکردن و پێکهێنـانی پەیکـەرێکی زمانـەوانی کـە لەبەرچـاوماندا ڕەنگـە نـوێ دەرکـەوێت، کـە هـۆنراوە و قەصـیدەکانیان بـوون، بـەڵام لەڕاسـتی و حەقیقەتیاندا نوێ نەبوون و بەقاڵب یان کەرەستە سەرەتاییەکانی کە لێی دروستکراون کۆن بوون و شکڵە نوێیەکانیان لەسەری دروستکردووەتەوە. جـا ئەمانـەی خـوارەوە چـەند نمونەیـەکن لـەو قاڵبانـە، هـەموویانم تـەنها لەسـەرەتای هـۆنراوە و قەصـیدەکانەوە وەرگرتـوون، ئەمـەش بەسـە بەڵگەیەك بێت لەسەر فراوانیی قەبارەی ئەم دیاردەیە لەشیعر و هۆنراوەی عەرەبیدا:

(وَمَنْ يَكُ ذَا... وإنّي امْرُؤٌ إنْ.. ألا هَلْ أتى عَنَّا.. ألا ليْتَ شعْرِي هل.. ألا انْعمْ صَبَاحا أيُّهَا الرَّبْع.. خَليلَيَّ مُرَّا بِي.. أمِنْ آلِ أسْمَاءَ الطُّلُولُ الـدَّوارِسُ.. يا صَاحِبَيَّ تَلَوَّما.. وَدِّع أمَامَةَ إنّ.. أهَاجَكَ مِنْ أسْمَاءَ رَسْمُ الـمنَازِلِ.. سَما لَكَ شَوقٌ بَعْدَما كان.. لـمنْ طَلَلٌ بَيْنَ الجَديَّةِ..).

لەڕاستیدا زمانی سروش (وەحی) هەموو ئەم پێوەرانەی هەڵگێڕایەوە، قاڵبە بەمیرات بەجێماوەکانی پارچەپارچە کـرد، لـەو تـانوپۆ زمانەوانییـە کلاسـیکە دەرچـوو و تـانوپۆی تایبـەت بـەخۆی هێنایـەبوون، قـاڵبی

زمانەوانیی نوێی بۆ خۆی داهێنا کە لەدواتردا گوژم و لەرزینێکی لەتۆماری زمانی ئەدەبیی لای عەرەبدا دروستکرد. ئەم قاڵبە نوێیانە لەسەر بەشێکی ڕووبەرە زمانەوانییەکەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز قەتیسنەبوون، بەڵکو ئەو قاڵبانە هەموو ئەو ڕووبەرەی بەجۆرێك گرتەوە کە تۆ لەڕێی تاکە نمونەیەکی هەڕەمەکیی وەرگیراو لە هەر ڕستەیەك یان قاڵبێك لەقورئانی پیرۆز، نا، بەڵکو لەڕێی بچووکتریش لەقاڵب" وەك گوزارشت یان دارشتەوە، دەتوانیت قورئانیبوونی ئەو قاڵبانە بسەلمێنیت و جیای بکەیتەوە و نیشانی بکەیت.

## زۆرینەی قاڵبەکانی قورئان، دووبارە نابنەوە تیایدا:

ئەم "خەسڵەتە" زۆر تایبەتەی قاڵبە قورئانییەکان دەگونجێت وامان لێبکات گومان ببەین کە دووبارەبوونەوەیان بەزۆریی لەقورئاندا، سەرەڕای نوێگەرییان و جیاوازیی هەموویان لەقاڵبە عەرەبییە ناسراوەکان، هۆکاری ئەوەیە کە بەئاسانی دەیانناسینەوە و بەخێرایی درك بە قورئانیبوونیان دەکەین. ئەوەی سەیرە ئەوەی کە لەو قاڵبە قورئانییانە دووبارە نابێتەوە لەقورئاندا سەرەڕای ئاشکرایی ئەم دیاردەی دووبارەبوونەوەیە، زۆر زۆرترە لەوەی دووبارە دەبێتەوە. زۆرینەی قاڵبەکان یەك جار لەقورئاندا دێن نەزیاتر و لەگەڵ ئەوەشدا خەسڵەت و تاموچێژی تایبەت و ڕوونی خۆیشی دەمێنێت. هەرچی قاڵبە مرۆییەکانی ئێمەیە، جا شیعر و هۆنراوە بێت یاخود پەخشان، قورسە جیاکردنەوەیان و سەقامگیرکردنی شکڵ و

بنیاتیان لەبیر و زەین و یادگەماندا ئەگەر چەندین جار دووبارەیان نەکەینەوە تا دەروونمان پێی ڕابێت و گوێکانمان پێی ئاشنا بێت. جا ئەوە تایبەتمەندییەکی دیکەی سەیرە لەناو تایبەتمەندییەکانی زمانی قورئانی دانادا: ڕاهاتن و هۆگریمان بەو قاڵبانەی کە هەرگیز دووبارە نابنەوە و یەك جار دێن.

لەوانەیە بوترێت: بۆچی هەر تەنها قورئان تایبەت دەکەیت بە بوونی قاڵبە ناوازە و تایبەتەکانەوە، خۆ هەر نووسەرێك قاڵبی تایبەتی خۆی هەیە بۆ نوسین کە هەڵگری خاسیەت و بنیاتی جیاکەرەوەی خۆیانن؟. ئەمە تا ئاستێك ڕاستە، بەڵام نەك تا ئەوپەڕی. شێوازە مرۆییەکانی نوسین بەهەموو جیاوازییەکانیانەوە هەمیشە یارمەتیمان نادات لەجیاکردنەوەی خاوەنەکانیان هەریەکە و لەوی دیکە، جا با لەڕووی کات و شوێن (زەمان و مەکان)ـەوە دووریش بن لەیەك. زۆرجار ڕوویداوە دوو نووسەر یان زیاتر، لەشێوازی نوسینیاندا نزیکن لەیەك، بەجۆرێك کە لێمان تێکەڵ دەبن. جا ئەم ڕاستییە بەوە زیاتر ڕووندەبێتەوە کە تەنها یەك ڕستە لە نوسینی هەریەکەیان بهێنین و بەراوردی بکەین لەگەڵ ڕستەی نوسەرەکانی دیکەدا. کێ لەئێمە دەتوانێت سەیرێکی ئەم قاڵبانەی خوارەوە بکات کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و خێرا لە چەند ئەدیبێکی جیاواز، دێرین و هاوچەرخ، کۆمان کردوونەتەوە، با جوان لێی وردببێتەوە و پێمانبڵێت: کامیان هی "ئەلمەعەڕی" و کامیان هی

"ئیبنولـموقەففەع" و کامیـان هـی "ئیبنوحـەزم" و کامیـان هـی "تـەها حسەین" و کامیان هی "مستەفا سادق ئەڕڕافعی"یە:

(وأمّا الكتابُ فَجَمَع حكمةً ولَهْواً ـ وإنّ هذا لَيُولِّدُ من الحزنِ والأسَف غيرَ قليل ـ يبْتَدِعُون أساليبَ ومناهِجَ في نظْمِ الكَلام ـ لا يخَافُ على وَلَدِهِ مِنَ اليُتْمِ ـ ولكنَّ الفَنَّ البَيانِيَّ يرْتَفِعُ عَلى ذلك).

بەڕاسـتی ئەسـتەمە بـۆ هەریەکـەمان جـا چـەندێك توانـا و لێهـاتوویی ئەدەبی و وردبینیی ڕەخنەگرانەی هەبێت بتوانێـت نـاوی ڕاسـتی هەریـەك لەو پێـنج نوسـەرە بخاتـە بـەردەم ڕسـتە ڕاسـتەکانی خۆیـان، مەگـەر بـە ڕێککەوت شتی وەها ڕووبدات، بەڵام دانانی تاقە یەك ئایەت، هەر ئایـەتێك بێـت، درێـژ بێـت یـاخود کـورت، لـەنێوان ئـەو پێـنج ڕسـتە مرۆییانـەدا، سەرەڕای جیاوازیی سـەردەمەکانیان و دووریـی قوتابخانـە ئەدەبییـەکانی خاوەنـەکانیان، وادەکـات زۆر بەئاسـانی چ کەسـی شـارەزا و چ کەسـێکی سەرەتایی دەستبەجێ بە پەنجەکانی ئاماژە بکـات و بەوپـەڕی متمانـەوە بڵێت: ئا ئەوەیان ئایەتە. {خـاوەنی ئـەو پێـنج ڕسـتەیە یەکلـەدوای یـەك ئەمانەن: ئیبنولموقەففەع (کەلیلـە و دیمنـە) ل/٦٨. ئیبنـو حـەزم (طـوق الحمامة) ل/٢١٦. تەها حسەین (في الادب الجـاهلي) ل/٣١٥. ئەلـمەعەڕڕی (رسائل أبي العلاء الـمعري) ب/٣، ل/٥٨٧. ئەڕڕافیعی (وحي القلـم) ب/١، ل/١٦}.

## چڕیی قاڵبە قورئانییە ناوازەکان:

لەڕاستیدا ئەو قاڵبە قورئانییانەی کە دووبارە نابنەوە زۆر زیاترن لەوەی هەژمار بکرێن، زۆریش ئاسانە لەهەر لاپەڕەیەك لە پەڕەکانی قورئانی پیرۆزدا دەستبخەینە سەر ژمارەیەکی زۆریان و بیانناسینەوە. جا بۆ ئەوەی برِیار و قسەکانمان بابەتییانە بن و لەملا دانەیەك و لەولا دانەیەك نەبن، لەسەر یەکەم لاپەڕەی تەواوی قورئان هەڵوێستە دەکەین، ئەو لاپەڕەیە لەزۆرینەی چاپە بەردەستەکانی قورئانی پیرۆزدا ئایەتەکانی ژمارە (٦ تا ١٦)ی سورەتی (البقـرة) دەگرێتەخۆ، ئەمەش بۆئەوەی چڕیی قاڵبە قورئانییەکان و فرەییان تیایدا ڕوون بکەینەوە. زۆر ئاسان تەنها لەم لاپەڕەیەدا دەتوانین بەلایەنی کەمەوە (٢٣) قاڵب بدۆزینەوە کە هەریەکەیان بنیاتێکی جیاواز و سەربەخۆی خۆی هەیە، جیاواز نەك هەر لە قاڵبە عەرەبییەکانی شیعر و پەخشان، یان لەقاڵبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت)، بەڵکو جیاواز تەنانەت لەو قاڵبە قورئانییانەی دیکە کە لەهەمان پەڕەدا هاتوون. جا سەیر دەکەین دەبینین ئەو قاڵبانە سەرەڕای ناوازەبوونیان و جیاوازبوونیان و سەرەڕای کاریگەریی زمانەوانیی قورئان لەسەر زمانەکەمان و کەمەندکێشکردنی قەڵەمی نوسەرانمان بەشێوازە باڵاکەی، بەڵام هێشتا زۆرینەی ئەو قاڵبانە تائەمڕۆش تایبەتن بەگوزارشتی قورئان نەك گوزارشتی مرۆڤەوە، هەرگیزیش لەهیچ زمانێکی ئەدەبیی دیکەدا بەدرێژایی سەردەمەکان نایبینین:

سەیربکەن و دیقەت بدەن:

١ـ (سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ).

٢- (وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ).

٣- (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا).

٤- (وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ).

٥- (وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ).

٦- (فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا).

٧- (وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ). (دووبارەی قالّبی ژمارە ٢).

٨- (بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ).

٩- (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ).

١٠- (إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ).

١١- (أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ).

١٢- (وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ).

١٣- (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ).

١٤- (قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ).

١٥- (أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ). (دووبارەی قالّبی ژمارە ١١).

١٦- (وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ). (دووبارەی قالّبی ژمارە ١٢).

١٧- (وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا).

١٨- (وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ).

١٩- (إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ). (دووبارەی قالّبی ژمارە ١٠).

٢٠- (اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ).

٢١- (وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ).

٢٢ـ (أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى).
٢٣ـ (وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ).

تەنها چوار قاڵب لەم قاڵبانە، وەك تێبینی دەکەین، دووجار دووبارە بوونەتەوە، بەڵام هەر (٢٣) قاڵبەکە هەموویان قاڵبی قورئانین و لەهیچ کام لەقاڵبە زمانەوانییەکانی ئێمە، یان قاڵبە زمانەوانییەکانی فەرموودە ناچێت، تەنانەت دەتوانین لەهەر قاڵبێکی مرۆیی، شیعری بێت یان پەخشانی، جیایان بکەینەوە ئەگەر بێتو تێکەڵیان بکەین. جا ئایا عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی چۆن ڕووبەڕووی ئەم زریانەی گوزارشتە ناوازانە بوونەتەوە کە لەمەککە هەڵیکردووەتە سەریان؟ ئایا پێگەی زمانی قورئانی پیرۆز لەبەرامبەر ئەو دامەزراوە زمانەوانییە زەبەلاحەدا لەکوێدایە کە پێش ئیسلام گەشەی کردووە و بووژاوەتەوە؟ دەبێت کاردانەوەی عەرەبەکان، ئەوانەی کە لە بازاڕێکی زمانەوانیدا کە تەنها چەند دە یان سەد دانەیەك قاڵبی بنەڕەتیی کلاسیکیی دووبارە زیاتری تێدا نەبوو و تێدا نەناسرابوو، خەریکی مامەڵە و ئاڵوێری قاڵبەکان بوون و ڕاهاتبوون پێی، دەبێت کاردانەوەیان چۆن بێت وا کتوپڕ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کتێبێکی تانوپۆ چنراو بەهەزاران قاڵبی زمانەوانی نوێی ئەوتۆ کە نە شیعر و نە پەخشانیان لەپێشتردا شتی وایان بەخۆیانەوە نەدی بوو، و لەدواتریشدا هەرگیز شتی وەها بەخۆیانەوە نابینن؟

## سروشتی قاڵبی قورئانی و داڕشتنەکەی:

جیاوازبوون و تاقانەبوونی قورئان لە هەردوو قاڵب و وشەکانیدا و پاشان لە پەیوەندیی وشەکان و پەیوەندیی داڕشتە و گوزارشتەکانی بەیەکترەوە، زمانێکی تایبەت و جیاکراوە پێکدەهێنێت و دروست دەکات کە تەنانەت بۆ خوێنەری ئاساییش ئەستەمە لەگەڵ شێوازە مرۆییە ناسراوەکاندا تێکەڵی بکات. ئەوەی وامان لێدەکات کە ڕستەی قورئانی و ڕستەی مرۆیی جیابکەینەوە، لەڕاستیدا نە وشە قورئانییە تایبەت و تاقانەییەکانە بەتەنها، هەروەها نە ئەو داڕشتانەیە کە وشەکانی لەسەر داڕێژراوە، نە ئەو ڕیتمە ڕەوانبێژییە هارمۆنییەیە کە بەدەوری داڕشتەکاندایە، هەروەها نە ئەو وێنە قورئانییە نوێیانەیە کە سەرسامی کردووین، نە ئەو مانا ئیلاهییە نوێیانەیە کە بەدانایی و هەیبەت و هەمیشەییبوون و باڵابوونیان بەسەر مانا مرۆیی و خاسیەتەکانیاندا جیادەکرێنەوە و تایبەت دەبن، هەروەها نە ئەو وتارە ئاسمانییە تاقانەیی و ناوازەیەشە کە تواناداری تەواو بەتوانا و متمانەداری تەواو متمانەن و دەستباڵا و ئاگادارکار و فەرماندار و باڵاترن بەسەر ڕۆحی لاوازی مرۆییەکاندا، نا، هەموو ئەمانە نیین بەتەنها... بەڵکو هاوتەریب لەگەڵ هەموو ئەوانەدا ئەو "قاڵب و داڕشتە"یەیە کە هەموو ئەو ڕەگەزانە کۆدەکاتەوە و دەیانخاتە پاڵ یەك و بەوەش یەکەی زمانەوانیی بچوکی ئەوتۆی لێ دروستدەکات کە لەنێوان خۆیاندا ڕستە یان قاڵبی بەجۆرێك دروستدەکەن کە ئەگەر لەگەڵ هەزاران ڕستە یان قاڵبی زمانەوانیی

مرۆییـدا تێکـەڵ بکـرێن دەتـوانن گوزارشـت لـەخۆیان بکـەن و، بنیـات و تایبەتمەنـدیی وشـە و گوزارشـت و ڕەوانبێـژی و ڕیتمـەکانیان بێنـەگۆ و قورئانیبوونی خۆیان بسەلمێنن.

لەڕاستیدا بچوکترین گۆڕانکاری لەقاڵبی قورئانیدا دەبێتە هۆی ئـەوەی کـە کێشـی خۆیـان لەدەسـتبدەن، (کـێش، بـەواتای کێشـی زمانـەوانی، الوزن). جا قاڵبـە قورئانییـەکان بەقـەدەر ژمارەیـان کێشـیان هەیـە، ئـەو کێشانەش نە لەسەر "حەرەکات و سـکون" (لـەرە و نالـەرە) دامـەزراون، وەك چۆن لە کێشی شیعریدا هەیە، نە لەسـەر ڕێسـا مرۆییـەکانی ئێمـەش لەڕێکخسـتنی پیـت و هاڕمۆنییانـدا، چـونکە چـەندین جـار ئـەو قاڵبـە قورئانییانە لەو ڕێسا مرۆییانـەی ئێمـە دەرچـوون کەچـی ئـەو دەرچـوونە بووەتـە هـۆی زیـاتربوونی نـەرمی و ناسـکی و باشـتر دەربڕینیـان. ئـەها سەیری بکە ئەمە شەش (میم)ـە لەئایەتی (وَمَـنْ أَظْلَـمُ مِمَّـنْ مَنَـعَ مَسَـاجِدَ اللَّهِ) (البقرة: ١١٤) بەدوای یەکدا دێن کە لەڕووی جوانخوێندنەوەی قورئان (تەجوید)ـەوە بەمشێوەیە دەخوێنرێتـەوە: (أَظْلَـمُ مِـمْ مَـمْ مَ)، هـەروەها ئەمەش هەشت دانە (میم)ـە کە لەئایەتی (وَعَلَى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ) (هود: ٤٨) بەدوای یەکدا دێن کـە لـەڕووی جوانخوێندنـەوەی قورئـان (تەجوید)ـەوە بەمشێوەیە دەخوێنرێتەوە: (أُمَـمِمْ مِمْ مَمْ مَـ)، کەچی لەگەڵ ئـەم بـەدوای یەکداهاتنی یەك دەنگەوە هەست بەو قورسی و زمانتێکەڵبوونە ناکەین کە ئەگـەر هـەمان شـت لـە زمـانی مرۆیـی خۆمانـدا ڕووبـدات خێـرا هەسـتی پێدەکەین. بەڕاستی (کێش) یـان (ڕیـتم)ی قورئـانی لەپێکهێنانیـدا چـەند

هۆکار و ڕەگەزی پـەنهانی دیکـە بەشـدار دەبـن کـە هەسـتدەکەم ئـامڕازە ڕەخنەییەکانمان هێشتا دەستەوسانن لەوەدا هـیچ یارمەتییـەك پێشـکەش بکـەن تـا بیاندۆزینـەوە و دیارییـان بکـەین. ئـەم ڕاسـتییەش ژمارەیـەك لەبیرمەندە خۆرئاواییەکان ئەوانەی کـە لەتوێژینەوەکانیانـدا بـەرخوردیان لەگـەڵ قورئانــدا هــەبووە جـەختیان لەسـەر کردووەتــەوە و باســیان لەڕەنگدانەوە سەیرەکانی قورئان کـردووە لەدەروونیانـدا تەنانـەت ئەگـەر لەماناکەیشـی تێنەگەیشـتبن، هـەروەك لـەم نوسـینەی (جیفـری لانـج)ی نوسەری ئەمەریکی ئەو ڕاستییە دەبینین:

"پێویسـت بـەوە ناکـات مـرۆڤ مسـوڵمان بێـت تـا هەسـت بـەم هێـزە ناسروشـتییەی قورئـان بکـەین، چـونکە زۆر کەسـی (نامسـوڵمان) پـاش درککــردن بــە نمونــەی ئــەم تێبینییانــە و بەهۆیانــەوە ئیســلامیان هەڵبژاردووە. هەروەها، زۆر لەوانەی کە توێژینەوەیان لەبارەی ئیسلامەوە کـردووە لـە کەسـانی نامسـوڵمان، بڕیـاری ئـەوەیان داوە (کـە ئیسـلام هەڵبـژێرن). "ئارسـەر جیهـ ئاربـەری" زانـای زمـانی عـەرەبی، بەڕەگـەز بەریتانی، باسی ئەوەی کردووە کە چۆن قورئان لە ماوەیەکی تەنگەبەر و نارەحەتی ژیانیدا پشتگیری بووە. وتوویەتی: گوێگرتنی ئەو بۆ قورئان کە بەزمانی عەرەبی دەخوێنرایەوە بۆ ئـەو وەك گـوێگرتنی بـووە لـە ترپـەی دڵی. هەروەها "فریدریك دینی" نوسەری نامسوڵمان، باسی ئەو "ئەزمونە نـاوازە دڵەڕاوکێیــە" دەکــات کــە مــرۆڤ هەنــدێکجار کاتێـك قورئــان دەخوێنێتــەوە پیـادەی دەکـات (و هەسـتی پێـدەکات) کاتێـك خوێنــەر

دەستدەکات بە هەستکردن بە "ئامادەگییەکی ناڕوون، هەندێکجار ترسێنەر"، جا لەجیاتی ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە خوێنەر هەستدەکات ئەوە قورئانە خوێنەرەکە دەخوێنێتەوە". (سەرچاوە: حتى الملائكة تسأل، جيفري لانج، و: زين نجاتي: ١٩٥).

بەڵام گرنگە ئاگامان لەو ڕاستییەش بێت کە لەوانەیە هەندێکجار بەهۆی سەرقاڵییمان بەدۆزینەوەی سروشتی نوێی تانوپۆی زمانەوانیی قورئان" لەو ڕاستییە بێئاگا ببین، ئەوەش ئەوەیە کە ئەم تانوپۆ نوێیە تا ئەمڕۆشمان هەر بەنوێ و تازەیی ماوەتەوە. هەموو شتێکی نوێ کە ئەمڕۆ پێنوس نوسیبێتی یان بەسەر زاری مرۆڤێکدا هاتبێت ئەوا هێندەی پێنەچووە بۆ سبەینێ کۆن بووە، ئا ئەو قاڵبە زمانەوانییانەی کە شاعیری سەردەمی نەفامی پێشکەشی کردوون کاتێك بۆ یەکەمجار هێناونی، نوێ و تازە بوون، بەڵام هێندەی پێنەچووە کاتێك کە شاعیری دواتر و دواتر لەشیعرەکانیاندا هێناویانە و بەکاریانهێناوە، ئیتر بووەتە قاڵبێکی کۆن و دووبارە. بەڵام قاڵبە قورئانییەکان زۆرینەیان زەمەنیان گرتووە و کات و زەمەن لەو ساتەدا کە قاڵبە قورئانییەکە دابەزیوە وەستاوە و ڕێگەی نەداوە کەسی دیکە بۆ هەمیشە دووبارەی بکەنەوە.

جا هەرچەندە زمانی فەرموودەی پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێبێت) بەهەردوو شێوازە جیاکراوە و جیاوازەکەیەوە: فەرموودەی قودسی و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا خۆی، ئەوەندە تایبەتمەندیی هەیە کە جیای بکاتەوە و ئاستی لەڕووی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی و جوانییەوە

بەرزبکاتـەوە بـۆ ئاسـتێکی نائاسـایی، بـەڵام هێشـتا ئـەو تایبەتمەندییـە مرۆییە سەربەخۆیەی خۆی پاراستووە کە بەڕوونی و بێ گـرێ لـەئیعجازی زمانەوانیی ئیلاهی جیای دەکاتەوە. بیهێننە بەرچاوی خۆتان بەڕێوەبەری کارگەیـەك کرێکارەکـانی کۆبکاتـەوە و وتارێکیـان بۆبـدات، دەیـەوێت لەوتارەکەیـدا پێیانبڵێـت هەرکەسـێکیان بەرپرسـیارێتیی هەڵـەکانی لەئەستۆی خۆیدایە، و بۆ گەیاندنی ئەو مانایەش پێیباش بوو سوود لـەم گوزارشتە قورئانییە ئاشنایە وەربگرێت:

(وَلَـا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى) (فـاطر:١٨). (هـیچ گوناهبارێـك گونـاهی کەسانی دیکە هەڵناگرێت). بەڵام بەڕێوەبەرەکە نایەوێت هەمان گوزارشتە قورئانییەکە دووبارە بکاتەوە و هەوڵدەدات لای خۆیەوە وشەی دیکەی بۆ دابنێت بەبێ ئەوەی بنیاتی زمانەوانیی گوزارشتە قورئانییەکە بگۆڕێت، بۆ ئـەم مەبەسـتە پێیبـاش بـوو کـە وشـەی "یحمـل" و لـەجیاتی وشـە قورئانییەکەی "تَزِرُ" دابنێت، وتی:

(ولا يَحْمِلُ حَامِلَةٌ حِمْلَ أخرى)، کە هاومانای ئایەتەکە دەگەیەنێت، ئەو هـەر بـەوەی کـە قاڵبـە قورئانییـە زۆردیـارو جیاکراوەکـەی خواسـت ئـیتر لەسـنوری وەرگـرتن (اقتبـاس) و تێهەڵکێشـکردن چـووەدەر چـونکە قاڵبەکەی وەك خۆی هێشتەوە و تەنها وشە مرۆییەکانی خۆی کردەبـەر و تەنها ئەوەندەشی بەس بوو کـە وشـەیەکی دیکـەی خسـتە جێگـەی وشـە قورئانییەکە، کە هەمان مانا قورئانییەکـە و هـەمان کێشـی هـەبوو، بـەڵام سەرەڕای ئەوە دیقەت دەدەین ئـەو مەخلوقـە زمانەوانییـە ئیفلـیج و جـێ

گاڵتەجاڕی و بەزەییەی هێنایەبوون کە من لێرەوە خەریکە بەڕونی ئەو گاڵتەپێکردن و بەزەییە دەبینم بەسەر ڕووی ئێوەوە کاتێك گوزارشتەکەی بەڕێوەبەری کارگەکەکە دەخوێننەوە.

## سورەتێکی هاوشێوە بهێنن:

ئیتر هەر ئابەو شێوەیەش باووباپیرانمان لەڕابردوودا پێکەنیون و ئێمەش ئێستا، پێکەنینمان دێت و گاڵتەدەکەین و بەزەییمان دێتەوە بەو هەوڵە هیچ و بەردەوامانەی کەسانێك کە دەیانەوێت لە قورئان و ئیسلام بدەن و بۆ ئەو مەبەستەش هەوڵدەدەن پەیکەری زمانەوانیی شێواو دابنێن و بانگەشەی ئەوە بکەن ئەوە سورەتی قورئانین. جا چەندێك ساختەکاران هەوڵ بدەن شتێك بخەنە ناو قورئانەوە کە قورئان نییە یان ڕستەیەك یاخود گوزارشتێك دابڕێژن یان شتێك کە ئەوان بانگەشەی دەکەن گوایە سورەتە دابنێن، ئەوا تایبەتمەندییە وشەیی و داڕشتەییەکانی قورئان و قاڵبە تایبەت و جیاوازەکانی ئاشکرایان دەکات، ڕێك وەك چۆن ئێستا تاقیکردنەوەی (DNA) لەتاقیگەی پزیشکاندا هەر کەسێك ئاشکرا دەکات کە بیەوێت منداڵێك بداتە پاڵ کەسێکی دیکە یان کارێك بداتە پاڵ بکەرێکی دیکە. بەڕاستی جەستەی زمان و زمانەوانیی قورئان هەموو خوێنێکی زمانەوانیی نوێ ڕەتدەکاتەوە کە بمانەوێت بیکەینە ناوی، ئەو گروپە خوێنە سەرپێچیکارە بەهەڵکوتانە ناو جەستەکە هەرچیی خانەی دەوروبەری خۆی هەیە پیس دەکات.

## قاڵبی پێغەمبەرانە، قاڵبی زمانەوانیی فەرموودە:

جا بۆ زۆر دوور بڕۆین؟ ئا ئەوەتە فەرموودەی پێغەمبەری خوامان لەبەردەستدایە (درودی خوای لێبێت)، ئایا ئەوەی بەسەر زمانی ئاسماندا جێبەجێ دەبێت بەسەر زمانی فەرموودەشدا جێبەجێ دەبێت؟ ئاخۆ ئەگەر هەمان ئەزمونی پێشوو بەسەر فەرموودەدا جێبەجێ بکەین دەقێکی جێی پێکەنین و بەزەییمان دەستدەکەوێتەوە؟ ئەی چۆن دڵنیا بین زمانی پێغەمبەری ڕێزدار سەرەڕای گەورەیی ئەو زمانە و باڵابوونی و تاقانەبوونی شێوازەکەی، بەڵام ئەویش هەر زمانێکی مرۆییە و هەڵگری ئەوەیە دزەبکرێتە نێوان دێڕەکانی یاخود ساختەکاریی تێدابکرێت؟ جا جارێکی دیکە و بۆئەوەی بنەمای "هەڵبژاردن" لەتوێژینەوەکەماندا پەیڕەو نەکەین، و کار بە بنەمای "یەکەمینەکان" بکەین کە بەهەمان بنەما ئیشمان لەسەر قاڵبە زمانەوانییەکانی یەکەم لاپەڕەی قورئانی پیرۆز کرد و پاشانیش بۆ لایەنی جێبەجێکاریی کردارەکی لەم بەشەی کتێبەکەماندا بەهەمان شێوە یەکێك لەو سورەتانەمان هەڵبژارد کە زوو دابەزیون لەقورئاندا کە سورەتی (الْمُدَّثِّر)ـە، ئەمجارەش فەرموودەیەك دێنین بۆ تاقیگە زمانەوانییەکەمان کە دەستپێکی یەکێك لەبەناوبانگترین کتێبە کۆکراوەکانی فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەری خوایە، کە ئەویش کتێبی (ریاض الصالحین)ی ئیمامی نەوەوییە، بۆچی؟ تا ئەو جیاوازییەی نێوان زمانی ئیلاهی و زمانی پێغەمبەرانە ڕوونبکەینەوە کە بێگومان لای هیچ کەسێکی دروستبینیش شاراوە نییە:

(عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ – رضـي الله عنـه – قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ – صلى الله عليه وسلم – يقول: "إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْـرِئٍ مَـا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَـى اللَّـهِ وَرَسُـولِهِ، وَمَـنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَنكِحُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَـا هَـاجَرَ إِلَيْـهِ". مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ).

واتە: لەعومەری کوڕی خەتتابەوە خـوا لێـی ڕازی بێـت گێڕدراوەتـەوە فەرموویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو درودی خوای لێبێت دەیفەرموو: بەڕاسـتی هـەموو کردەوەکـان بـەپێی نیـاز و نییەتـە، هـەموو کەسـێکیش بەپاداشتی نیاز و نییەتی خۆی دەگـات، کـەوابوو هەرکەسـێك کۆچـکردنی لەمەککـەوە بـۆ مەدینـە بـۆ لای خـوا و پێغەمبەرەکـەی بوویێـت، ئـەوا کۆچەکەی قبوڵە و بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی دەبێـت، هەرکەسـێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دونیایی بێت یاخود بۆ گەیشتن بـەئافرەتێك بێت تا هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات، ئەوا کۆچەکەی بەپێی نییەتەکەیـەتی و بۆ ئەو شتە بۆیدەنووسرێت کە کۆچی بۆ کردووە".

جا ئەنجا دیقەت بدە، زۆر ئاسانە بۆ هەریەکـەمان گوزارشـتی تایبـەتی خۆی بەبەکارهێنانی قاڵبە زمانەوانییـە پێغەمبەرانەکـەی کـە لەسـەرەتای فەرمودەکەدا هاتووە، دروست بکات: (إِنَّمَـا الأَعْمَـالُ بِالنِّيَّـاتِ)، بـۆ نمونـە بڵێت: (إِنَّمَـا العِبْـرَةِ بِالنَّتَـائِجِ) (پەنـد لەئەنجامدایـە) بـەبێ ئـەوەی ترسـی ئەوەی هەبێت لەنەریتە زمانەوانییە مرۆییەکانمان دەربچێت یـان بترسـێت خۆی خستبێتە بەر تانەوتەشەری گاڵتەپێکردن یاخود ڕوبـەڕوی ڕەخنـەی

کەسێك ببێتەوە. هەروەها زۆر ئاسانە ڕستە مرۆییە تایبەتەکەی خۆت لەسەر بنەمای قالبە زمانەوانییە پێغەمبەرانەکەی دوای قالبی یەکەم دابڕێژیت: (وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)، بۆ نمونە بڵێیت: (وَإِنَّمَا لِكُلٍّ مُتَسَابِقٍ مَا أحْرَز) (هەر پێشبڕکێکارێك بەپاداشتی بردنەوەکەی دەگات) بەبێ ئەوەی هەست بەهیچ نەنگییەکی زمانەوانیی بکەیت، یان ترسی کۆمێنت، قسەیەکی گاڵتەجاڕانەی کەسێکت هەبێت. هەروەها ئاسانە بەزمانی سادەی خۆت ڕستەیەك دروست بکەیت لەسەر شێواز و ڕیتمی بەشەکانی دیکەی ئەو فەرموودەیە، بۆ نمونە بڵێت: (فَمَنْ كَانَتْ غايَتُهُ الجهاد، فَأجْرُهُ عظيم، وَمَنْ كَانَتْ غايتهُ مَالاً يَرْبحُهُ أو شُهْرَةً يَنالُها، فَأجْرُهُ هو ما اختار لِنَفْسِه)، (ئەوەی مەبەستی تێکۆشان بێت، ئەوە پاداشتی گەورەی بۆهەیە، ئەوەیشی ئامانجی پارەیەك بێت بەدەستیبهێنێت یان ناوبانگێك بێت پێیبگات، ئەوە پاداشتەکەی هەر ئەوەیە کە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و مەبەستی بووە)، بەبێئەوەی هیچ گاڵتەپێکردنێك یان بێزارییەك لای ئەو کەسانە دروست بکات کە دەیخوێننەوە یان گوێبیستت دەبن.

ئەوەی ڕاستی بێت زمانی فەرمودەی پێغەمبەری خوا بە هەزاران فەرموودەی هەڵبەستراوی تێخزێنراوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە زاناکانمان دەستەوسان بووبن لەبەدواداچوونی ئەو فەرمودە دزەکردووە هەڵبەستراوانەدا. ئەوان توانیان بەسیستەمە سەرکەوتووەکەی ڕاستاندن بەشێوەیەکی نیمچەدڵنیا و کۆتایی فەرمودەی ڕاست و (صحیح) لەفەرمودەی هەڵبەستراو جیابکەنەوە. (جێی ئاماژەیە پێغەمبەری

سەروەر سەلامی خوای لێبێت لەچەندین فەرمودەدا هۆشیاری داوە لەئەگەری ڕودانی ئەو دزەکردنە، و زیاتر لەبنەمایەکی بۆ مسوڵمانان داناوە بۆجیاکردنەوەی وتەکانی لەو قسانەی کە ئەگەری هەیە درۆهەڵبەستان و نەیاران بەناوی ئەوەوە بینوسن، وەك چۆن لەم فەرمودەدا هاتووە:

"ئەگەر گوێبیستی وتەیەك بوون لەمنەوە گێڕدرابێتەوە دڵتان پێی ئاشنابوو، مووتان بۆی نەرم بوو و ڕوخسارتان بۆی کرایەوە و واتان دەبینی کە نزیکە لێتان، ئەوا من لەئێوە نزیکترم پێی (ئەوە وتەی منە)، ئەگەریش گوێبیستی وتەیەك بوون لەمنەوە گێڕدرابێتەوە دڵتان ڕەتی دەکردەوە و موو و ڕوخسارتان پێی گرژ دەبوو (واتە خەریکە بێزاریتان بەرامبەری لەسەر موی جەستە و پێستان دەردەکەوت)، و واتان دەبینی دوورە لێتانەوە، ئەوا من لەئێوە دورترم لێیەوە"، ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتییەوە).

## نوێگەریی داڕشتە و گوزارشت:

بەڵگەی ناوێت کە بڵێین کاتێك باسی داڕشتە و گوزارشت و قاڵب و پەیوەندییە زمانەوانییەکان دەکەین لە قورئاندا و لێیان دەکۆڵینەوە، هەندێکجار ڕووبەڕووی هەندێك گرانی و ئاستەنگ دەبینەوە لە دیاریکردنی سنورێکی ڕوونی نێوان ئەو ڕەگەزانەی باسمان کردن، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین لەژێر ئەم ناونیشانەدا ئەو ناوچەیە نەبەزێنین کە گوزارشت و داڕشتە بەشیانکردووە بۆ خۆیان، بۆ نمونە ناگەڕێینەوە بۆ ناوچەی تاکوشەی ڕووت لەبەرئەوەی ئەم ناوچەیە تایبەتە تەنها بە وشە و دەستەواژەکان، ناچینە پێشیشەوە بۆ ناوچەی چواروشەوزیاتر لەبەرئەوەی ناچارمان دەکات بارەکەمان لەسنوری قاڵبدا بخەین کە یەکەیەکی زمانەوانیی گەورەیە کە دەکرێت داڕشتە و گوزارشت بگرێتە خۆی یان ئەم دووانە بچنە ناویەوە، بەڵام ئەو: واتە قاڵب ناچێتە ناو ئەوانەوە و ئەوان قاڵب ناگرنەوە. لەسەر ئەم بنەمایە لێرەدا تەنها ئەو ڕشتانە دیاریدەکەین کە بەزۆریی لەدوو یان سێ وشە پێکدێن لەوانەی کە لەسەر بنەمایەکی زمانەوانیی ڕێزمانیی یان ڕەوانبێژیی نوێی ئەوتۆ بنیاتدەنرێن کە زمانی عەرەبی پێش قورئان نەیناسیون و پێیانئاشنا نەبووە. بەڵام زۆرجار سنوری نێوان داڕشتە و گوزارشت بەجۆرێك تێکەڵ دەبن کە بۆ جیاکردنەوەیان ڕووبەڕووی بارگرانی دەبینەوە، لەبەرئەوە لەم توێژینەوەیەدا واڕێککەوتووین کە:

"دارِشـتە – الترکیـب" ئـەوە بێـت کـە مانایـەکی تـەواومان نـاداتیّ و زۆرینەی مادده خاوەکانی بریتین لەئامراز و پیتەکان.

"گوزارشـت – التعـبیر"یش ئەوەیـە کـە مانایـەکی تـەواو یـان نیمچـەتەواومان دەداتـیّ و زۆرینـەی مـادده خاوەکانیشـی بـریتین لـە نـاو (الاسماء) یاخود کردار (فرمان – الافعال).

## دارِشتەی قورئانی:

قورئانی پیرۆز بەیەك جار و لەماوەی چەند ساڵێکی کەمی دابەزینیدا، هەزاران دارِشتە و گوزارشتی نوێی بۆ عەرەب هێنـا کـە سورەتە کـورت و درێژەکانی وەك یەك تەژی بوون لێیان، زۆریشیان چـوونە نـاو فەرهـەنگی زمانـە ئـەدەبیی و رۆژانەییەکەیانـەوە، ئەگەرچـی زۆرینـەی تـەنها لەسـەر قورئان خۆی کورتبوویەوە و ناوازەبوون و جیاوازبوونە زۆرەکەیان رێگـەی پێنەدان خۆیان بخزێننە ناو ئەو فەرهەنگانەوە.

ئایەتـەکانی خـوای گـەورە رۆژانـە دەخوێنرێنـەوە، لەوانەیـە دەیـان لـەم دارِشتانە لەهەر خوێندنەوەیەکدا بەسەرماندا تێپەرِ بێت بەبیّ ئـەوەی هـەرگیز هەڵوێستەیەکیان لەسەر بکـەین یـاخود شـتێکی نائاسـایی یـان نـارِوونی تێدا بەدی بکەین، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئولفەتمان بەو دارِشتانە گرتـووە و راهاتووین کە لە قورئاندا پێشبینیی شتی دیکـەی جگـە لـەوە نەکـەین. بـەڵام ئەگـەر لەسـەرخۆ کـەمێك لەسـەریان رابوەسـتین، و یادگـەمان لـەو راهاتنـە بـەزمانی قورئـانی پـیرۆز بـەتاڵ بکەینـەوە و بگەرِێینـەوە بـۆ زمـانی ئاسـایی ئەدەبی یان رۆژانەیی خۆمان بـەجۆرێك وەك بڵێـی هـیچ زمانێـك نـازانین جگـە

لەمە، ئەوکات خۆمان ڕوبەڕوو لەگەڵ زمانێکی تەواو نوێدا دەبینینەوە کە سەرەڕای ئەوەی لەسەر بنەمای زمانی مرۆیی ئێمە بنیات نراوە، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بەم زمانە مرۆییەی ئێمەوە نییە. وەرن لەگەڵمدا ئەم دارشتانە بخوێننەوە کە زۆرینەیان زۆر لەقورئاندا دووبارە بوونەتەوە، ئەنجا بزانن چۆن بەچاوپێداخشاندنێکی خێرا جیاوازبوون و تایبەتیبوونیان لەچاو دارشتە مرۆییەکانی ئێمەدا کە لەتەنیشتیانەوە پێشنیازم کردووە، ڕووندەبێتەوە بۆتان:

- (مَنْ ذَا الَّذِي): (من الذي).
- (هَلْ عَسَيْتُمْ). (هل ينتظر منكم).
- (فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا). (فما داموا عاجزين عن أن يأتوا).
- (بَعْدَ إِذْ). (بعد أن).
- (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا). (وهكذا جعلنا).
- (وَإِنَّ كُلًّا لَمَّا). (وكل واحد منهم).
- (إِنْ كَادَ لَيُضِلُّنَا). (كاد أن يضلّنا).
- (أَوَلَوْ جِئْتُكَ). (حتى إنْ جئتُك).
- (فَلَمَّا أَنْ جَاءَ). (فلما جاء).
- (إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ). (إننا سنغلبهم).
- (فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ). (آمنين هنا).
- (قَلِيلًا مَا). (ما أقل).

## داڕشتە و گوزارشتە نوێیەکان لەسورەتی (الـمُدَّثِّر)دا:

سەرەڕای سنورداربوونی ئامادەگیی داڕشتە لەدەقەکانماندا بەگشتی، لەبەرئەوەی وەك باسمان کرد بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە ئامرازەکان دەبەستێت، بەڵام هێشتا دەتوانین لەسورەتی (الْـمُدَّثِّر)دا ئەم دوازدە داڕشتە نوێیەی خوارەوە بدۆزینەوە:

(فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ ـ كَلَّا إِنَّهُ ـ فَقُتِلَ كَيْفَ ـ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ ـ إِنْ هَذَا إِلَّا ـ وَمَا أَدْرَاكَ مَا ـ كَذَلِكَ يُضِلُّ ـ كَلَّا وَالْقَمَرِ ـ لَمْ نَكُ مِنَ ـ فَمَا لَهُمْ عَنِ ـ كَلَّا بَلْ لَا ـ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ).

هەرچی سەبارەت بە گوزارشتە نوێیەکانی سورەتەکەیە، ئەوا لەوانەیە ئەوە لەپێشتر بێت کە لەخۆمان بپرسین: جا بۆ هەر لەبنەڕەتدا هیچ گوزارشتێکی ناتازە و نانوێ لەسورەتەکەدا هەیە؟ سورەتی (الْـمُدَّثِّر) لە(٥٦)ئایەتی لەدوو لاپەڕە کەمتر پێکدێت، زۆرینەی ئایەتەکانیشی (بەلایەنی کەمەوە ٣٠ ئایەتی) لە دوو وشە یان سێ وشە زیاتر نابن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین لەسورەتەکەدا نزیکەی (٥٦) گوزارشتی قورئانیی نوێ بژمێرین. ئەنجا قەبارەی بارستەی گوزارشتە نوێیەکانی سورەتەکەتان هێنایە بەرچاوی خۆتان چەندەیە؟ (٥٦) گوزارشت لەگەڵ (١٢) داڕشتەی نوێ، هەموویان لە (٥٦) ئایەتدا هاتوون کە ژمارەی وشەی زۆربەیان لە دوو وشە یان سێ وشە تێناپەڕێت، ئەمەش واتە: گوزارشتە نوێیەکان هیچ ڕووبەرێکی ئەوتۆیان بەجێنەهێشتووە ـ ئەمە ئەگەر وا دابنێین بەجێیان هێشتووە ـ بۆ ئەو گوزارشتانەی کە عەرەب پێش قورئان

زانیونی. جا لەوەش مەزنتر و سەیرتر و سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە (٥٢) لەو گوزارشتانە (٥٢ لەکۆی ٥٦) تەنها لەسورەتی (الْـمُدَّثِّر)دا هاتوون و لەهیچ سورەتێکی دیکەدا دووبارە نەبوونەتەوە. ئەم ڕاستییەش سەرلەنوێ نـەک تەنها نوێگەریی زمانی قورئانمان بۆ دووپات دەکاتەوە بەڵکو ئەوەمان بـۆ دووپات دەکاتەوە کە هەر سورەتێک کەسـایەتیی زمانـەوانیی سـەربەخۆی خۆییشی هەیە، کە ئەمە لەبەشی دووەمی توێژینەوەکەماندا سەبارەت بـە سـورەتە کورتـەکان بـەردەوام لەسـەری دەوەسـتین و قسـەی لەسـەر دەکەین. ئەمانەی خوارەوەش گوزارشتە نوێیەکانی ئەم سورەتەن: –

(يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ – قُمْ فَأَنْـذِرْ – وَرَبَّـكَ فَكَبِّـرْ – وَثِيَابَـكَ فَطَهِّـرْ – وَالرُّجْـزَ فَاهْجُرْ – وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ – وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ – فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ – يَوْمٌ عَسِيرٌ – عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ – ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا – وَجَعَلْـتُ لَـهُ مَالًا – مَالًا مَمْدُودًا – بَنِينَ شُهُودًا – مَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيدًا – يَطْمَـعُ أَنْ أَزِيـدَ – كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا – سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا – فَكَّـرَ وَقَـدَّرَ – فَقُتِـلَ كَيْـفَ قَـدَّرَ – عَبَسَ وَبَسَرَ – أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ – سِحْرٌ يُؤْثَرُ – سَأُصْلِيهِ سَقَرَ – لَا تُبْقِي وَلَـا تَذَرُ – لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ – أَصْحَابَ النَّـارِ – وَمَـا جَعَلْنَـا عِـدَّتَهُمْ – فِتْنَـةً لِلَّـذِينَ كَفَرُوا – الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ – يَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا – فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ – أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا – يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ – جُنُودَ رَبِّكَ – ذِكْرَى لِلْبَشَرِ – وَالْقَمَرِ – وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ – وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ – لَإِحْدَى الْكُبَرِ – نَذِيرًا لِلْبَشَرِ – أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ – بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ – أَصْحَابَ الْيَمِينِ – فِي جَنَّـاتٍ يَتَسَاءَلُونَ – يَتَسَاءَلُونَ عَنِ الْمُجْرِمِينَ – مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ – لَـمْ نَـكُ مِـنَ

الْمُصَلِّينَ – وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ – نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ –يَوْمِ الدِّينِ – نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ – أَتَانَا الْيَقِينُ – شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ – عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ – حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ – فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ – يُؤْتَى صُحُفًا مُنَشَّرَةً – لَا يَخَافُونَ الْآخِرَةَ – إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ – فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ – يَشَاءَ اللَّهُ – أَهْلُ التَّقْوَى – أَهْلُ الْمَغْفِرَةِ).

جا جگە لە هەردوو گوزارشتی (لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ – يَشَاءَ اللَّهُ) کە هەردووکیان دواتر بوونە بەشێك لەفەرهەنگی زمانەوانیی فەرمیمان، تەنانەت ڕۆژانەیشمان، ئیتر هەموو گوزارشتەکانی دیکە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت تەنها و تەنها وەك گوزارشتی قورئانی ماونەتەوە.

## وشەکان و ئیعجازی کۆکردنەوە لە نێوان "نوێگەری و ڕوونی":

سورەتەکانی قورئانی پیرۆز پڕکراون بە ژمارەیەکی زۆر وشەی نوێ. ئەمەش پاڵی بەزۆرکەس لەگومانکارە خۆرئاواییەکانەوە ناوە کە بانگەشەی ئەوە بکەن زمانی قورئان عەرەبی نییە، وەك بڵێی قورئان خۆی بەڕاشکاوانە و زیاد لەجارێك جەختی نەکردبێتەوە لەسەر ئەوەی بە"زمانێکی عەرەبیی پاراو" دابەزیوە. یەکێك لەدواهەمین ئەو کەسانەی زیادەڕەوییان لەم بانگەشەیەدا کردووە "کریستوف لوکسنبرگ"ی خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانییە کە لەکتێبەکەیدا بەناونیشانی (خوێندنەوەی سریانی – ئارامی بۆ قورئان) کە بەزمانی ئەڵمانی ساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە گومانی ئەوە دەبات گوایە قورئان محەممەد "دایناوە" و لەپاشخانێکی

کریستیانەوە وەریگرتووە. {چیرۆکی پاشخانی کریستیانی، بەردەوام خۆرهەڵاتناسان و مژدەدەران دەیجوونەوە و دەیلێنەوە}، هەروەها دەڵێت گوایە زمانی قورئان عەرەبی نییە بەڵکو سریانی/ئارامییە و زمانی ئەو بازرگانانەیە کە دەچوونە مەککە و تێکەڵی خەڵکەکەی دەبوون، ئەو خۆرهەڵاتناسە پێیوایە واتا و ماناکانی قورئان بەپێی ئەم "ڕاستییە" تەواو جیاوازە لەبۆچوونی موفەسسیرە مسوڵمانەکان.
Christoph Luxenberg. The Syro-Aramaic Reading of the] Koran: A Contribution to the Decoding of the Language of the Koran. English Edition. Germany: 2007].

---

لەڕاستیدا ئیعجازی وشەسازیی تەنها لەنوێگەریی وشەکانی قورئاندا خۆی نابینێتەوە و بەس، چونکە ئەم وشانە – بەپێچەوانەی بانگەشەکەی لوکسنبورگەوە – لەسەر دارشتە و پێوەرگەلی ئەوتۆ هاتوون کە لە بڕبڕەی ڕێسا زمانەوانییەکانی زمانی عەرەبین، تەنانەت دەتوانین بڵێین تاقە وشەیەکی قورئانیش لەو دارشتنە عەرەبییە دەرناچن، بەڵام سەرسامییەکە لەوەدایە کە هەموویان لەچێوەی ناوکۆیەکی (سیاق) زمانەوانیی ناوازەدا هاتوون کە سەرەڕای نوێگەریی و تازەییان ڕێگە بەخەڵکی دەدات لەماناکانیان تێبگەن. جا کۆکردنەوە و بەیەکەوەهێنانی "نوێگەری" و "ڕوونیی واتاکان" لایەنێکی دیکەیە لە لایەنەکانی ئیعجازە سەرسوڕهێنەرەکەی نوێگەریی لەزمانی قورئانی پیرۆزدا.

## گرنگیی وشە نوێیەکان:

دۆزینەوەی یەك دانە وشەی نوێ لەلایەن شاعیر یان ئەدیبێکەوە لای عەرەب بەسەرکەوتنێکی گەورە دادەنرا، نەخوازەلا ئەگەر ئەو وشەیەش جێی خۆی لەعەقلّ و دلّدا بگرتایە و بەوەش دەکەوتە سەر زاری خەلّکی و پێنوسی نوسەر و شاعیران دەیاننوسی و بەکاریاندەهێنا. جا هاتنی وشەیەکی وەها لەدەقی شیعری شاعیرێکدا ئەگەر یەك جاریش بێت بەس دەبوو بۆئەوەی عەرەبەکان ئەو وشەیە بقۆزنەوە و شاعیرەکەی بەناوەوە ناوبنێن تا بەسەر ناوە بنەڕەتییەکەی شاعیرەکەشدا زالّ ببێت. بۆ نمونە شاعیر "نابیغەی زوبیانی" ناوەکەی لەو قسەیەی خۆیەوە بەدەستهێناوە کە دەلّێت: (فَقَدْ نَبَغَتْ لَنا مِنهُمْ شُؤون)، هەروەها (المرقّش الاکبر) ئەو ناوەی لەو وتەیەی خۆیەوە بەدەستهێناوە کە دەلّێت: (رَقّشَ في ظَهرِ الأديمِ قَلَم)، هەروابێتەوە "المسَيَّب بن عَلَس" ئەو نازناوەی لەوتەکەی: (غِزارا فقولوا للمسَيَّبِ يَلْحَق) بەدەستخستووە.

جا کاتێك لە زمانی قورئانی پیرۆز دەکۆلّینەوە دەبێت هەندێك ڕاستی لەبارەی وشە نوێیەکان بەتایبەت بخەینە بیری خۆمان. شتێکی زۆر ئاسانە تەنانەت بۆ منداڵێکیش کە وشەیەك دابنێت، بەلّکو چەندێك حەز بکات وشەی نوێ دابتاشێت، مادام (٢٩) پیتی لەبەردەستدایە. ئەو دەتوانێت ئەم پیتانە بەجۆرێك پاشوپێش و ڕێکبخات کە ملیۆنان وشەی نوێی پێدروست بکات، بەلام پرسیاری هەرە گرنگ ئەوەیە: کێ دواتر لەو وشانە تێدەگات؟ ئایا بەهای ئەدەبییان چەندە؟ ئیتر ئالێرەدا بەڕوونی

ڕاستیی ئیعجازی قورئان پرشنگ دەدات و خۆی دەنوێنێت کە کارەکە لە قورئاندا لەسەر ئەوە کورتنەبووەتەوە کە عەرەب هەر لەگەڵ یەکەمجار بیستنی وشە نوێیەکانی قورئان دەستبەجێ لێی تێگەیشتوون، بەمەرجێك لەگەڵ خۆیدا زمانێکی نوێی بەهەموو ڕەگەزەکانی و ڕەهەندە بنەڕەتییەکانییەوە بۆهێناون، لەڕەگەزەکانی: وشە و ئامراز و زاراوە و داڕشتە و گوزارشت و قاڵب و پەیوەندییە زمانەوانییەکان و باوە ڕێزمانییەکان و بیرۆکە و یاسا نوێیەکان و هەواڵە مێژووییەکان و ڕاستییە زانستییەکان. جا ئیعجازی قورئانی بەرامبەر بە عەرەب لە تەنهاتێگەیشتنیان لەوەی دەیانبیست تێپەڕی بوو، گەیشتبووە ئاستی سەرسامبوونی زۆریان بە وشەکانی، سەرسامبوونێك تا ئاستی ئەوپەڕی، هەروەها گەیشتبووە ئاستی دانانی بێزۆرلێکردنی باوەڕدار و بێباوەڕیان بەبالآیی قورئان و ئەستەمبوونی گەیشتن بە ئاستەبەرزەکانی.

لەڕاستیدا بەئاسانی تێبینی ئەوە دەکەین کە وشە نوێیەکانی قورئان لەژێر یەکێك لەم ناونیشان و جۆرانەی خوارەوەدا جێیاندەبێتەوە:

١ـ ئەوەی کە وشەکە لای عەرەب ناسراوبووە بەڵام قورئان مانایەکی زاراوەسازیی نوێی پێبەخشیوە کە لەڕێی ئەو ناوکۆ (سیاق)ـە تایبەتە زمانەوانی یاخود ڕەوانبێژییەوە درك دەکرێت کە وشەکە تیایدا هاتووە. بۆ نمونە وشەکانی: (سلطان – مرض – تولّي – أسلم – الدنيا – الصالحات – الشاهدين – الشهداء – الرّوح – خاشعين – نبتهل – إصر – كتاب –

البينة – البِرّ – عوَج – الحَرث – ينظرون – يَسطون – المهتدون – البُروج – القدْر – يَقْدِر – يُقَدِّر).

٢ـ يان ئەوەیە کە وشەکە بە داڕشتە تازەکەی، نوێیە، بەڵام لە چاوگێکی زمانەوانییەوە وەرگیراوە کە عەرەب پێشتر زانیویانە، ئەمەش زۆرترین وشە نوێیەکانی قورئان دەگرێتەوە. بۆ نموونە: (آتاه – ملكوت – طاغوت – الجاهلية – صلوات – هادوا – مقامع – الفرقان – الرقيم – مرقوم – المحراب – القَصَص – غُزَّى – المحتظِر – الأنعام – دَحاها – سُعُر – تَزاوَر – مُلْتَحَد – العادون – ربَّانيّون – قانتون – المنافقون – عِلّيّون – شُكور – الحَيَوان – السّوأى – السلسبيل – تِلقاء – واعدْنا).

٣ـ يان دەگونجێت وشەکە قۆناغی نوێگەری و داهێنانی تێپەڕاندبێت و چووبێتە قۆناغێکی دەوڵەمەندتر و کارلێکی زیاتر لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەدا، ئەوەیش قۆناغی سەقامگیری و بڵاوبوونەوە و زۆر بەکارهێنانە، بەوەش بەرزبووەتەوە بۆ ئاستی (زاراوە)، ئەم جۆرە وشانە بەتاکە وشەکە خۆی یان هەندێك جار بە پەیوەستبوونی بەوشەیەکی دیکەوە گوزارشت لەمانایەکی زۆر گەورەتر لەقەبارەی خۆی دەکات، وەك: (المؤمن – الكافر – الذّكر – المساجد – الساعة – الأجر – التقوى – الحَسَنة – السيّئة – النِّكاح – الغيب – الشهادة – الصلاة – الزكاة – الإيمان – الجهاد – الشّرك – الآخرة – القيامة – النار).

٤ـ ئەوەی کە نە وشەکە و نە چاوگی وشەکە، هیچیان ناسراو نەبوون و پێشتر بەکارنەهێنراون، قورئان دروستی کردوون و هێناونیەتییە بوون،

پاشان لەناوکۆیەکی زمانەوانییدا هاتوون کە گوێگر یاخود خوێنـەر بـەرەو مانـا نوێیەکـە جـا چ بـەدیاریکراوی بێـت یـان بـە ئامـاژە و ناڕاسـتەوخۆ، ئاڕاستە دەکەن. زۆرجاریش ئەم جۆرە وشانە لەزمانی دیکەوە بەعـەرەبی کراون، بەتایبەتی لە فارسی و یۆنانی و حەبەشـی و (نبطـی) و سـریانی و عیبری و قیبتییەوە، نمونەی ئەم جۆرە ئەمانەن: (الصراط – سـبحانك – أبّ – قسورة – سِجّين– برزَخ– سِجّيل– السِّجِلّ– التنّـور – ضـيزى – قمْطرير – سندُس – اِسْتَبْرق – أباريق – القِسط – القسطاس – الفِردَوس – الـمشكاة – طـوبى – قـراطيس – سُـرادق – تنّـور – إلّ – كرسـيّ – الأرائك – الجِبْت – الطّور – اليَمّ).

٥ـ هەنـدێك جـاری دیکـە دەکرێـت وشـەکە نوێگەرییەکـەی لـەو مانـا مەجازییە نوێیەوە دەستبکەوێت کـە قورئـان بەسـەریدا بڕیـوە و ئـەوەش هێزی وێنەی ڕەوانکـاریی و ڕەوانبێـژیی پێـداوە. ئەمـە لەڕاسـتیدا ڕێگـای لـەدایکبوونی زۆرینـەی وشـەکانە لەزمانـە جۆراوجۆرەکانـدا. جـا قورئـان زمانی عەرەبیی بەسەدان وشەی نوێی لەم جـۆرە دەوڵەمەنـد کـردووە کـە پێشتر زمانی عەرەبی هەر نەیناسیون و نـەیزانیون و پێیانئاشـنا نـەبووە. لەوانە: (الإسلام – الكُفر – يتزكّى – السِّدرة – الـميزان – الحَرث – الهُدى – الضَّلالة – التَّقوى – الأمة – اللباس – الـمحصنات – الآية – الأوّاب – الأجَل – الوازِرة – الحافِرة – السّاهِرة – الخُنَّس).

لەگەڵ ئەمەشـدا، ئێمـە بـۆ سەلـماندنی ئیعجـازی نوێگـەریی لـەزمانی قورئانی پیرۆزدا، وەك خوێنەر بەئاسانیی بـۆی ڕوون دەبێتـەوە، پشـتمان

به بڕی "وشه نوێیه‌كان"ی ناو قورئان نه‌به‌ستووه، هه‌رئه‌وه‌نده به‌سه كه بزانین وشه نوێیه‌كانی سوره‌تی (الفاتحة) له پێنج وشه تێپه‌ڕ ناكات: (الرحمن – العالمین – الدین "به‌واتای ڕۆژی لێپرسینه‌وه" – الصراط – الضالین)، ئه‌وه‌ش له‌كۆی (٥٨) پێگه‌ی زمانه‌وانیی نویّ كه له‌م سوره‌ته‌دا دۆزیومانه‌ته‌وه و دیاریمان كردوون.

له‌ڕاستیدا قورئانی پیرۆز وه‌ك چۆن قالب و داڕشته و په‌یوه‌ندییه زمانه‌وانییه تایبه‌ته‌كانی له‌گه‌ڵ خۆی هێنا، به‌هه‌مان شێوه وشه تایبه‌ته‌كانی خۆیشی هێنا. به‌لام پێویسته هۆشیار بین له‌دیاریكردنی هه‌ردوو جیاوازییه زۆر گرنگه‌كه‌ی نێوان پێگه‌ی هه‌ریه‌ك له‌وشه‌ی قورئانی و قالبی قورئانی. به‌ڕاستی وشه‌كانی قورئان نه‌ك هه‌مووی، ته‌نانه‌ت نه‌ك زۆرینه‌شی، نویّ نه‌بوون بۆ زمانی عه‌ره‌بی به‌به‌راود به قالبه‌كانی، ئه‌مه له‌لایه‌ك، له‌لایه‌كی دیكه‌وه وشه‌كانی قورئان قورس نه‌بووه بۆ وه‌رگرتن و به‌كارهێنانیان له‌زمانی مرۆیی ئێمه‌دا، به‌پێچه‌وانه‌ی قالبه‌كانییه‌وه. له‌ڕاستیدا قالبه قورئانییه‌كان وه‌ك (په‌نجه‌مۆری كه‌سایه‌تی) وه‌هایه بۆ قورئان، به‌جۆرێك ئه‌سته‌مه هیچ قالبێكی زمانه‌وانیی مرۆیی دیكه بتوانێت دیواری پۆلایینی ببڕێت و دزه بكاته ناویه‌وه.

## وشە نوێیەکان لەسورەتی (الـمُدَّثِر)دا:

بەئاسانی دەتوانین لەسورەتی (الْـمُدَّثِّر)دا کە (٢٥٦) وشەیە و لەکەمتر لەدوو لاپەڕەدا هەڵکەوتووە، نزیکەی (٨٤) وشەی نوێ دیاری بکەین، واتە نزیکەی سێیەکی کۆی وشەکانی. لەو وشە نوێیانەش ئەمانەن:

- (الرُّجْز)، (زاراوەیەکی نوێ: واتە بتەکان، یاخود سزا).

- (النَّاقُور)، (شێوەدارشتەیەکی نوێ: ئەو کەرەنایەیە کە ئیسرافیل فووی پێدا دەکات).

- (صَعُودًا)، (وێنەیەکی رەوانبێژیی: واتە سزایەك وەك هەڵزنان و بەرزبوونەوە بەچیادا).

- (بَسَر)، (وشەیەکی نوێ: واتە ڕوخساری ڕەش داگیرسا و گۆڕا).

- (لَوَّاحَة) "لِلْبَشَر"، (مانایەکی نوێ: واتە گۆڕەڕی ڕەنگی پێست "البَشَرَة"، یاخود: شتێکی دیارە بۆ خەڵکی "البَشَر").

- (كَفَرُوا)، (واتە: بانگەوازی ئیسلامیان ڕەتکردەوە، لەبنچینەی زمانەوانییدا واتای داپۆشین دەدات، واتە: عەقڵ و دڵی خۆیان داپۆشی و دایانخست).

- (أُوتُوا)، (شێوەدارشتەیەکی نوێ و مانایەکی نوێ: واتە پێیانبەخشرا، پێیاندرا).

- (رَهِينَةٌ)، (لەجیاتی وشەی "مسؤولة"، یان "محاسَبة" هاتووە، واتە بەرپرسیاری کردەوەکانیەتی، بارمتەی کردەوەکانیەتی).

ـ (سَـلَكَكُمْ)، (شێوەداڕشــتەیەکی نــویێ: واتــە: ڕاپێچــی کــردن، خستنیەناوی).

ـ (سَقَر)، (وشەیەکی نویێ: واتە دۆزەخ).

ـ (قَسْوَرَة)، (وشەیەکی نویێ: واتە شێر، یاخود تیرهاوێژان).

ـ (الْمَغْفِرَة)، (شێوەداڕشتەیەکی نویێ).

## بەکارهێنانی نوێی ئامڕازەکان لەسورەتی (الـمُدَّثِّر)دا:

هاوتەریب بەو سامانە وشەسازییە نوێیەی کە سورەتی (الْمُدَّثِّر)ی پـێ بارگـاوی کـراوە و پڕکـراوە لەوشـەی نـوێ، بـە جـۆرە جیاوازەکانییـەوە، بەئاسانیش دەتوانین بەلایەنی کەمـەوە (١٤) بـەکارهێنانی نـوێی ئـامڕازە دێرینەکان دیاری بکەین و بیدۆزینەوە، وەك چۆن لەبەکارهێنانی وشەکانی (كَانَ) و (مَا زالَ)دا بینیمان. لـەو بەکارهێنانـە نوێیانـە ئەوەیـە کـە پـیتی خستنەســەر (حَـرْفُ الْعَطْـف)ی (فــاء)، لەشـوێنی خۆیـدا وەك لــەزمانی عەرەبیدا هەیە، نەهاتووە، واتە لەنێوان دوو کردار یان دوو ناودا نەهاتووە کە دووەمیان بخاتە سەر یەکەمیان، بەڵکو لەسێ ئایەتی یەکلـەدوای یـەك (٣–٥)دا لــەنێوان بــەرکاری پێشــکەوتوو (الــمفعول الــمتقدم) و کــرداره دوواکەوتووەکەیدا (الفعل الـمتأخر) هاتووە: (وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْـزَ فَــاهْجُرْ)، پاشــان جــارێکی دیکــە لــەنێوان پەیوەســت بــوو پەیوەستکراودا هاتووە: (وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ).

هەروەها ئامرازی وەلاّم (كَلّا) كە لەزمانی باوی عەرەبیدا تەنها بەمانای "نەخێر" دێت، لێرەدا و لەچوار ئایەتی سورەتەكەدا (١٦-٣٢-٥٣-٥٤) بەمانای "هاواركردن بەسەردا و بەرپەرچدانەوە و ڕەتدانەوە" هاتووە، یان دەكرێت مانای "بەڕاستی – حَقّاً" بدات.

هەروەها ئامرازی پرسی (كَيْف)، لەهەردوو ئایەتی (فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ (١٩) ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ (٢٠))دا، مانای پرسیاركردن ناگەیەنێت، وەك لەزمانی ئاسایی عەرەبیدا باوە، هەروەها مانای چۆنیەتیش ناگەیەنێت، بەڵكو زیاتر لەوە نزیكترە كە پیتێكی چاوگی "حرف مصدري" بێت، وەك بلێی لەگەڵ كردارەكەی دوای خۆیدا چاوگێك دروست دەكات كە دەبێت جێگری بكەر (نائب الفاعل) كە لەبریدانانەكەی ئاوا دەردەچێت: (قُتِلَ تَقْدِيرُهُ) (مەزەندەكردنەكەی لەناوچێت)، یان بەلێكدانەوەیەكی دیكە: (لەپاداشتی مەزەندەكردنەكەیدا لەناوچێت و بەكوشت بچێت)، ئیتر لەسەر ئەم بنەمایە هیچ مانایەك بۆ "چۆنیەتی" یاخود "پرسیاركردن" لەهەردوو ئایەتەكەدا نامێنێتەوە.

هەروەها ئامرازی (إِنْ) لەهەردوو ئایەتی (فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ (٢٤) إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ (٢٥))دا بەمانای (لا) یاخود (لیس) دێت كە ئامرازی نەرێكردنن، كە ئەمەش دیاردەیەكی ناوازە و زۆر بەربلاوە لەقورئاندا كە لەقەبارە و سەیربوونەكەیدا لەدیاردەی (كان) دەچێت كە پێشتر باسمان كرد، هەروەها ئەم دیاردەیە بەهیچ جۆرێك لەشیعری سەردەمی نەفامیدا نەمدیوە.

بەڕاستی بوونی (٨٤) وشە، یان زاراوەی نـوێ لەسـورەتێکی بچـووك و زوودابەزیوی وەك ئەم سورەتەدا، دەکرێت لەدەروونی ئـەو کەسـانەدا کـە بـۆ یەکـەمجار گوێبیسـتی بـوون لـەرزە و شـڵەژانێکی دروسـت کردبێـت هاوشـێوەی ئـەوەی کـە تووشـی (عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە) بـوو کاتێـك لەپێغەمبەری خواوە (سەلامی خوای لێبێت) گوێبیسـتی (١٣) ئایەتەکـەی سەرەتای سورەتی (فُصِّلَتْ) بـوو، ئـەوەبوو بەسەرسـامی و شـڵەژانێکەوە کە دەتوت هیچ تێنەگەیشتووە لەوەی گوێبیستی بـووە بەمـەرجێك خـۆی زمانزان و ڕەوانبێژی هۆزەکەی بوو گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکە. جا دەبێت ئەو شۆك و شڵەقانە چەند بێت ئەگەر بێتو سەرەڕای بارسـتەی ئـەو وشـە نوێیانە، ڕەگەزە زمانەوانییە نوێیەکانی دیکەی سورەتەکەش لەوانە دەیان داڕشـتە و گوزارشـت و قـاڵبی زمانـەوانی و دەیـان وێنـەی ڕەوانکـاری و ڕەوانبێژی و گوزارشتی کراوە و قسەی پوخت و مانادار، بخەینـە پاڵیـان؟ ئەبێت چی ڕووی دابێت؟ ئەمە هەمووی هاوتا لەگەڵ ئەو ڕەهەندە فیکـری و کەلتورییـە نوێیانـەی کـە لەگـەڵ هـەموو ئـەم نوێگەرییـە زمانـەوانی و ڕەوانبێژییانەدا یەکتر دەبڕن و پێکەوە تانوپۆی سورەتەکە تەواودەکەن.

## سەرلەنوێ پێکهێنان و داڕشتنەوەی یەکە زمانەوانییەکان:

ئـەو گەردەلولـە زمانەوانییـەی کـە قورئـان دروسـتی کـرد و بەسـەر عەرەبەکانی سەردەمی یەکەمینیدا هێنـا، بـەدوای خۆیـدا کاردانەوەیـەکی قوڵی ئەوتۆی دروست کرد کـە لەگـەڵ قـەبارە زەبەلاحەکەیـدا بگونجێـت. بەڵام کە ئەوانەی نەوەی دووەم و نەوەی سێهەم و نەوەکانی دواتـر هـاتن ئـیتر وردەوردە ڕاهـاتن لەگـەڵ زمـانی قورئانـدا و ئولفـەتیان پێـوەگرت و بەوەش ئەو هەستکردن بە شۆکەی کە زمانە نوێیەکە لـەدەروونی نـەوەی یەکەمدا دروسـتی کردبـوو، ئـەمان لەدەسـتیان دا، تـا وای لێهـات دیـاردە زمانەوانییـــە قورئانییـــە نوێیـــەکان زۆر ڕاینـــەدەگرتن و ســـەرنجی ڕانەدەکێشـان، لـە ناویشـیاندا دیـاردەی "ئایـەت" ئـەو دیاردەیـەی کـە چەمکێکی نوێی لەبەرامبەر چەمکی "ڕستە" دامەزراند، کە ئەمەی دواییان پێکهێنەری یەکەی زمانەوانیی پەخشانی عەرەبی بوو. هەروەها دیـاردەی "ئایەت" چەمکێکی نوێ بوو لەبەرامبەر چـەمکی "بەیتەشـیعر – البیـت" کە پێکهێنەری یەکەی زمانەوانیی شیعر و هۆنراوەی عەرەبی بوو. جا ئەم یەکە نوێیە ئەوەی ئەوان لەسـەری ڕاهـاتبوون بەیەکـەوەی ببەسـتن، ئـەم جیای کردەوە، ئەوەی ئـەوان لەسـەری ڕاهـاتبوون جیـای بکەنـەوە، ئـەم بەیەکـەوەی بەسـتەوە، بـەوەش شـەبەقێکی لەبنـەما و بناغـەی بینـای زمانـەوانیی گشـتییدا دروسـت کـرد کـە تـوانی لەڕێیـەوە زمـانی عـەرەبی بگەیەنێتە کۆمەڵێك ڕەهەند و ئاسۆی نوێ و ئەنجا ئـەم ڕەهەندانـە بخاتـە پـاڵ سـنورە کلاسـیکییەکەی پێشـتری زمانەکـە و بـەوەش زمانەکـە

دەوڵەمەند بکات. لەگەڵمدا ئەم چەند وشە کەمەی سەرەتای سورەتی (ئال عیمران) بخوێننەوە:

(وَأَنْزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ (٣) مِنْ قَبْلُ هُدًى لِلنَّاسِ وَأَنْزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ...)، دیقەتتان دا چۆن پێشئەوەی ڕستەکە کۆتایی بێت ئایەتی سێهەم وەستا و تەواو بوو، واتە پێشئەوەی (نیمچەڕستەی تەواوکار)ی (مِنْ قَبْلُ) بەدوایدا بێت کە پەیوەستە بە کرداری (أَنْزَلَ) کە لەئایەتی ژمارە سێدا هاتووە، کە ماناکەی دەبێتە (أنزل التوراة من قبل). پاشان سەیرتان کرد چۆن پێچەوانەی ئەمە لەئایەتی ژمارە چواردا ڕوودەدات کاتێك سەرەڕای کۆتاییهاتنی ڕستەکە لەوشەی (للناس) و دەستپێکردنی ڕستەیەکی نوێ: (وأنزل الفرقان)دا، کەچی هێشتا ئایەتەکە بەردەوام دەبێت و درێژەی دەبێت. جارێکی دی ئایەتەکە بەردەوام دەبێت لەهەڵقوڵانی مانای نوێ سەرەڕای ئەوەی دیسانەوە لە وشەی (الفرقان)دا کۆتایی بەڕستەکە هاتووە و ڕستەیەکی تەواو نوێ دەستپێکردووە کە هیچ پەیوەندییەکی ڕێزمانیی بەڕستەی پێشووەوە نایبەستێتەوە: (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ).

جا با بێین بۆ سورەتی (الروم)، ئەگەر ئەم ئایەتانەی سورەتەکە بەجێبێڵین بۆ نەریتە زمانەوانییەکانی خۆمان ئەوا سەرلەنوێ بەجۆرێکی دیکە ژمارەیان دەدەینێ، بەجۆرێك کە ئایەتەکان لەهێڵەکانی // کە خۆمان پێشنیازمان کردووە کۆتایی دێن، ئەو هێڵانە بۆ ئەوە دامانناون کە

ببنــه جیاکــەرەوەی مرۆییانــەی ئێمــە کــە لەگــەڵ چــەمك و تێگەیشــتنە باوەکانمان بۆ یەکەی زمانەوانی، دەسازێت:

(الــم (١) غُلِبَـتِ الـرُّومُ (٢) فِـي أَدْنَـى الْـأَرْضِ // وَهُـمْ مِـنْ بَعْـدِ غَلَـبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ // لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ // وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ // يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ // وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٥)).

دیــارە نێوانــە قورئانییــەکان (الفاصــلة)ی ئــەم پێــنج ئایەتــە، هــیچ پەیوەندییــەکی بەدابەشــکارییە نەریتییــەکانی ئێمــەوە نییــە کــە هەمیشــە پشــت بــە بنــەمای سیســتەمی ڕســتە دەبەســتین. مەبەســت لــە (نێوانــە قورئانییەکان) ئەو خاڵەیە کە تێیـدا ئایـەتی پێشـوو دەوەسـتێت و تـەواو دەبێت و ئەنجا ئایەتی دواتر دەستپێدەکات.

**دۆخی نوێی ئامرازه پەیوەندییە کلاسیکییەکان (ئامرازی بەیەکەوەبەستن):**

سیستەمی نوێی (جیاکردنەوە و بەیەکەوەبەستن) کە زمانە نوێیەکەی قورئان دایهێنا، یەکێکە لەدیاردە زمانەوانییە زۆر بڵاوەکان لە قورئاندا. ئەوەی کە زیاتر ئەم دیاردەیە جیادەکاتەوە بریتییە لە لابردنی ئامرازە زمانەوانییەکانی پەیوەندی و بەیەکەوەبەستنی وەك (واو و فاء و إذ و إنّ و إنّما و قَد و ڕاناوە سەربەخۆکان) لەشوێنە کلاسیکییەکانی خۆیان کە نێوان ڕستە و گوزارشتەکانە، ئەو لابردنە بەجۆرێکە کە نەمانی سنورە هەرێمایەتییە ناسراوەکان کە ڕاهاتووین شوێنیان بکەوێتە نێوان دوو ڕستە یان دوو گوزارشتەوە، ڕاماندەچڵەکێنێت و شۆکمان دەکات. لەگەڵمدا ئەم ئایەتە بخوێننەوە:

(أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ قُلْ سَمُّوهُمْ أَمْ تُنَبِّئُونَهُ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي الْأَرْضِ أَمْ بِظَاهِرٍ مِنَ الْقَوْلِ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ) الرعد: ٣٣، واتە: (جا ئایا ئەو زاتەی کە سەرپەرشتیاری کار و کردەوەی هەموو کەسێکە و دەزانێت چیان کردووە (وەك پەرستراو و بتەکانی تر وایە کە خەڵکی هانا و هاواری بۆ دەبەن؟). لەگەڵ گەورەیی و باڵادەستیی ئەو پەروەردگارەدا نەفامان شەریکیان بۆ خوا بڕیار داوە، تۆش بڵێ: ئادەی ناوی ئەو بت و هاوەڵانەم بۆ بێنن کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن؟ یاخود (بەهەموو عەقڵێکتانەوە) دەتانەوێت خوا ئاگادار بکەنەوە بەشتێك کە ئەو زاتە نایزانێت لەزەویدا؟! یان هەر دەتانەوێت ئاگاداری بکەنەوە بەقسەی سەرزارەکیتان، نەخێر ڕاستی هەر

ئەوەیە کە فێڵ و تەڵەکە و پلانی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بۆیان ڕازێنراوەتەوە و لەڕێبازی ڕاست وێڵ کراون). (تەفسیری ئاسان). جا ئەگەر بەدوای ئامڕازە لابراوەکاندا بگەڕێین لەئایەتەکەدا و بیانخەینەوە جێی خۆی، ڕێك وەك ئەوەی لەزمانی مرۆیی ئێمەدا هەن، ئەوا ئەنجامەکەی شتێکی وەك ئەمە دەردەچێت:

(أفـ(هكذا يكون) مَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَ(قد) جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ (فـ)ـقُلْ (لهم) سَمُّوهُمْ (إذن) أَمْ (تظنون أنكم) تُنَبِّئُونَهُ بِمَا لَا يَعْلَمُ (بما يوجد) فِي الْأَرْضِ أَمْ (إنّ هذا) بِظَاهِرٍ مِنَ الْقَوْلِ (منكم) بَلْ (الحق أنه قد) زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ).

بەوجۆرە لابردنەکان بەلایەنی کەمەوە تەنها لەم تاقە ئایەتەدا دە شوێن دەگرێتەوە. جا با هەریەکەمان لەم ئایەتانەی خوارەوەدا و لەو شوێنانەدا کە هێڵیان بەژێردا هاتووە هەوڵبدات بەزەینی خۆی ئامڕازە لابراوەکانی پەیوەندیی و بەیەکەوەبەستن دابنێتەوە:

- (وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا اللَّهُ أَوْ تَأْتِينَا آيَةٌ كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ) البقره: ١١٨.

- (قُلْ إِنِّي عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَكَذَّبْتُمْ بِهِ مَا عِنْدِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ). (الانعام: ٥٧).

- (وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ). (الرعد: ٢).

ئەم جۆرەی لابردن (الحذف) تەنها هەر شێوازێکی زمانەوانیی نوێ نییە کە قورئانی پیرۆز بۆ زمانی عەرەبی زیادی کردبێت و بەس، بەڵکو ئەوە زیادکردنێکی فیکری و ڕەوانبێژیی زۆر گرنگە، لەبەرئەوەی ڕەهەندگەلێکی واتایی و سێبەرێکی ئەندێشەیی دەبەخشێتە گوزارشتەکان کە پێشتر نەیانبووە. جا کاتێك چەند جۆرێکی جیاوازی ئەم لابردنە لەیەك ئایەتدا کۆدەبنەوە دەبینین ئایەتەکە بەم کۆمەڵبوونەی ئەو لابردنانە ڕەوانبێژیی و ڕوونییەکی ئەوتۆی دەستکەوتووە کە بووەتە واتادانێکی زیاتر و خراوەتە سەر مانا بنچینەییە پەتییەکە و بەوەش بازنەی واتای ئایەتەکەی فراوان کردووە.

## پەیوەندییە نوێیەکانی نێوان وشەکان:

ئەمانەی باسمان کردن هەموویان جێی خۆیان لەنێوان ئایەت یان ڕستەکاندا دەگرن، ئەی بڵێی بابەتەکە سەبارەت بە وشە و پەیوەندیی نێوان وشەکان چۆن بێت؟ لەڕاستیدا قورئان نزیکی و پاراوییەکی نوێی بۆ بەیەکەوەبەستنی وشەیەك بەوشەیەکی دیکەوە هێنایەبوون و داهێنا، کە ئەم جۆرە نوێیەی پەیوەندیی لەکەلتوری عەرەبیی ئەوکاتدا و لەکەلتورەکانی دیکەشدا ناسراو و باو نەبوو، تا لەم چەرخەدا و لەپاش سەرهەڵدانی قوتابخانە نوێیەکانی ئەدەب وەك "ڕەمزگەرایی و سوریالی" ئەنجا ناسران و باسکران. جا ئەم پەیوەندییە نوێیانە کە قورئان لەنێوان وشەکاندا دروستی کرد ئاسۆگەلێکی فیکریی و ئەندێشەیی نوێی

لەگوزارشتەکاندا بەرپاکرد کە خرایە پاڵ مانا بنچینەییەکەی وشەکان و بەوەش دووبارە بازنەی واتا و مانای فراوان کرد.

جا بۆ نمونە لەئایەتی ژمارە چواری سورەتی (الفاتحە) (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)دا، پەیوەندییەك لەنێوان وشەکاندا بەدی دەکەین کە تاکی عەرەبی سەردەمی هاتنی قورئان لە میکانیزمەکەی تێنەگەیشتووە، بەڵام بێگومان هەستی بەوە کردووە کە سروشتەکەی جیاوازە لەسروشتی گوزارشتەکانی خۆیەوە، هەروەها هێزی ئەو شۆکەی کە لەکاتی بیستنی یەکەمجاری ئایەتەکەدا، دایچڵەکاندووە و گیان و بوونی لەرزاندووە، بێگومان بەبێ ئەوەی ئەم ئایەتە داخڵی تاقیگە زمانەوانییە رەخنەگرییەکەی بکات، کە ئەو تاقیگەیەی هێشتا سروشتی و سەرەتایی بووە و ئاتاجی بە سادەترین ئامرازی کۆڵینەوە و شیکاری هەبووە لەو جۆرە پێشکەوتووانەی کە ئێستا ئێمە هەمانە. جا دیقەت بدە، ئەو پەیوەندییە نوێیەی نێوان هەردوو وشەی (مَالِك–خاوەن) و (يَوْم–ڕۆژ)دایە تا ئەوکاتە فەرهەنگی زمانەوانیی عەرەبی و ناعەرەبییش نەیزانیوە و نەیدیوە. واراهاتووین کە وشەی خاوەنداریی (مُلْك) بخەینە پاڵ شتێکی بەرجەستە کە بگونجێت خاوەنداریی بکرێت، بۆنمونە دەڵێین: خاوەن خانوو، خاوەن پارە، خاوەن پایسکیل، خاوەن ئۆتۆمۆبێل، خاوەن کەشتی... دەی کەوابێت چۆن "ڕۆژ" خاوەنداریێتی دەکرێت؟ (خاوەنی ڕۆژی دوایی)، ئایا زەمەن و کات خاوەنداریێتیی هەیە؟ ئایا بانك و تۆماری خانوبەرە و دارایی (تاپۆ) ڕازی دەبن ئەژمار و حساب بانکیی بکەنەوە بۆ خەڵك کە تیایدا کاتژمێر و ڕۆژ و

زەمەن سەرمایەکەی بێت؟ بەڕاستی ئەوەی ئایەتەکە شتێکی کتوپڕ و سورپرایزێکی زمانەوانیی خاوەن چێژێکی زۆر تایبەت بووە بۆ تاکی عەرەبی ئەو سەردەمە. بەڵام هەر ئەوەندە نییە، بەڵکو هەر لەگەڵ پێچکردنەوە و تێپەڕین لە وشەی (یَوْم) دیسانەوە سورپرایزێکی دیکە چاوەڕێی دەکات، هەرئەوەندەی ئەم هێما شڵەژێنەر و شڵەقێنەرەی هاتوچۆی تێپەڕاند هێمایەکی دیکەی بۆ هەڵدەکرێت کە ئەمیش لەدەرەوەی لێکدانەوە و حساباتەکانییەتی، هێماکەی دیکە لەنێوان هەردوو وشەی (یَوْم) و (الدِّین)دا هەڵدەتۆقێت و پڕشنگ دەدات.

تاکی عەرەب و تەنانەت ناعەرەبیش، وا ڕاهاتووە هەمیشە کات و زەمەن بخاتە پاڵ ڕووداوێکەوە کە لەو کات و زەمەنەدا ڕوودەدات، بۆ نمونە: خولەکێك بێدەنگی، کاتژمێرێك کار، ڕۆژی جەنگەکە، مانگی ڕۆژوو، ساڵی ماتەم، ماوەی جەنگەکە، سەردەمی ژیانەوە (ڕێنیسانس).. و بەو جۆرە. جا سورپرایزەکە لێرەدا ئەوەیە وشەی (الدِّین) لەفەرهەنگی عەرەبیدا بەلایەنی کەمەوە تا ئەوکاتە و پێشئەوەی درك بەو ڕۆڵە نوێیە بکات کە ئەو وشەیە لەئایەتەکەدا بینیویەتی، مانای "ڕووداو"ی نەدەدا، لەبەرئەوەی (الدِّین) لای ئەو ڕووداوێك نەبوو بەڵکو فیکرەیەکی پەتی بوو، جا خستنەپاڵی (الدِّین) بۆلای کات (یَوْم) بەریەککەوتنێکی هاتوچۆ یاخود شڵەقانێکی زمانەوانیی نوێ لەسەری تاکی عەرەب دروست دەکات کە هێشتا ئەو خۆی لەو ڕوداوی هاتوچۆیە بەئاگا نەهاتووەتەوە کە

تازەبەتازە تووشی بووە کە بریتی بوو لەخستنەپاڵی (مُلْك) بۆلای (یَوْم)، خستنەپاڵی (خاوەندارێتی) بۆ لای (کات و زەمەن).

ئیتر بەمشێوەیە وەرچەرخان/ سورپرایزەکان یەکلەدوای یەك لەبەردەم تاکی عەرەبی ئەوکاتدا کە خەریکی خوێندنەوە و ڕێگابڕینی ناو سورەتەکەیە، تۆپەڵ دەبن و کۆدەبنەوە، نەك هەر ئەم سورەتە، بەڵکو ئەمە بۆ سەرجەم سورەتەکانی دیکەی قورئانی پیرۆز هەر ڕاستە. کاتێکیش ئەمە ڕوودەدات سەلیقە مرۆییە کەمتواناکەی هەوڵدەدات لەو نامە کورت و "بروسك"ئاسایانە تێبگات و بیانخوێنێتەوە کە نامەگەلێکی چڕ و نائاسایین و یەکلەدوای یەك لەئاسمانەوە بۆی دێن، بەوەش ڕیزێك پەیوەندیی زمانەوانیی نوێ لەبەردەمیدا دەخرێتەڕوو کە پێی ڕانەهاتووە، پەیوەندیی نێوان ڕستەکان، نێوان گوزارشتەکان، نێوان وشەکان. جا لەگەڵ بەیەکگەیشتنی ئەم هەموو لایەنە نوێیانە کە قورئانی پیرۆز تیایاندا پێش زمانی عەرەبی کەوتووە، ڕەنگە پێش زمانەکانی دیکەش، دەتوانین بڵێین شۆڕشە نوێیەکە هەر لایەنی زمانی نەگرتەوە و بەس، بەڵکو ئەو لایەنەی تێپەڕاند و لایەنی ئەندێشەیشی گرتەوە، کە ئەم لایەنە خۆی لە وێنە ڕەوانبێژییەکان و بەکارهێنانە ناواتایی و شێوازە ڕەوانبێژییەکانی گوزارشت و دەربڕینەکاندا، بینییەوە.

## فەرهەنگی نوێی قورئانیی وێنەکان:

وێنــە ڕەوانکارییــە ڕەوانبێژییــەکان لای شــاعیرانی عــەرەب لــەپێش ئیســـلامدا، هـــەرخۆیان بـــوون دووبـــارە دەبوونـــەوە و شـــاعیران بەکاریاندەهێنایــەوە، هەرئەوەنــدە وێنــەی ڕەوانکــاریی و ڕەوانبێــژیی شاعیرێك دەبووە هۆی سەرنجی شاعیرێکی دیکە ئیتر ئەمیش وەریدەگرت و دەســتکارییەکی دەکــرد و لــەقاڵبێکی شــیعریی نوێــدا دایدەڕشــتەوە، هەندێك جاریش هەر وەك خۆی دەیپاراست و وەك قاڵبەکـەی یەکـەمجاری بەکاریدەهێنایەوە. جا ئەم کاریگەرییەی سەردەمی نەفامیی بەرلەئیسلام لەسەر هێڵی شیعری عەرەبی چەندین سـەدە پاشـئەوەش بـەردەوام بـوو، تەنانــەت لەوانەیــە دزەی کردبێتــە لای هەنــدێك شــاعیر و نووســەری هاوچەرخیش، بەڵکو تەنانەت گەیشتووەتە لای خەڵکی بەگشتی و لەقسـە وگفتوگۆی ڕۆژانەیاندا بەکاریدەهێنن. ئـەم وێنـە ڕەوانبێژییانـە هـەموویان لەژینگە سنورداره عەرەبییەکەوە وەرگیرابوون کە عەرەب تیایدا دەژیان، بۆ نمونە لای ئەوان: ئازا و دلاوەر شێرە، ترسـنۆك وشـترمل (نەعامە)یـە، بەخشـندە دەریایـە، ڕەزیـل و دەسـتقونجاو زەوییـەکی وشـك و بێبـەرە، کینەلەدڵ وشترە، زۆرخۆر فیلە، بەهەیبەت چیایە، جوان خۆر یان مانگە، پلەدار ئەستێرەیە، لاواز و کەمئاست مێخ و بزمارە (بچـوك و بێئەرزشـە)، پەلـەکار و سـەرەڕۆ وەك پەپولـە پەلەیـەتی و خـۆی دەکـات بـە ئـاگردا، بێــدەنگ و لەســەرخۆ بەرخــە، کەڵـــەڕەق و مێشــکپووچ قالۆنچــەیە،

شانازیکار تاووسە، تەڵەکەباز ڕێوییە، توندتەبیعەت ئاسن یان بەردە، زوڵف و قژ شەوە، پیریی و سپیبوونی قژ ڕۆژە، ددانی مەعشوق دەنکە تەرزەیە، زاری ئەنگوستیلەیە، لێوی بەردی بەنرخە، گۆنای گوڵ یان سێوە، فرمێسکەکانی مروارین، پەنجەکانی میوەی عوننابن، چاوەکانی نێرگزن، بالآی ڕمە، ڕیزی ددانەکانی گوڵە، تەوێڵی بەرەبەیانە، برۆکانی کەوانن، پەرچەمی سەرگۆنای دووپشکە... و چەندینی دیکە. ئەمە هەندێك لە وێنە ڕەوانبێژییەکانی عەرەب بوو تا ئەوکاتە و هەندێکیشیان تا ئێستاش بەکاردەهێنرێن.

قورئانی پیرۆز ئەم هەزاران وێنە بەمیراتماوانەی هەرهەمووی پشتگوێخست و لەکۆگای گوزارشتەکانی لایبردن، پاشان فەرهەنگی ڕەوانبێژیی تایبەت بەخۆی هێنا کە پڕاوپڕ بوو لەوێنەگەلی نوێ. هەرچەندە توێژینەوەیەکی گشتگیرم نەکردووە کە هەموو وێنەقورئانییەکان بەتەواویی بگرێتەوە و ڕووماڵیان بکات، بەڵام لەڕێی ئەو ئایەتانەی کە لەم توێژینەوەیەدا لەبارەیانەوە کۆڵیومەتەوە دەتوانم دڵنیا بم لەوەی کە گرکانی ڕەوانبێژیی قورئانی پیرۆز هەر لەوەدا کورت نەبووەتەوە کە کانگایەکی وێنەگرتنی نوێ و زەبەلاح و سەرسامکەری بۆ فەرهەنگی خەیاڵدان یان ڕەوانبێژانەمان زیاد کرد، بەڵکو هەروەك چۆن قاڵبە زمانەوانییە نەریتییەکانی لابرد بەهەمان شێوە هەموو وێنە ڕەوانبێژییەکان جا چ بەناوبانگ و بەکارهاتووەکان بن یان بێ ناوبانگەکان، ئەوانەی کە لە کەلەپورە شیعرییە زەبەلاحەکەی پێش

ئیسلامدا بەدی دەکەین، هەموویانی پشتگوێخست و لایبردن، ڕەنگە نەتوانین هیچ کامیان، نەك هەر نەتوانین، بەڵکو بەهیچ جۆرێك یەك دانە لەو وێنانە لەقورئانی پیرۆزدا بەدی ناکەین.

جا سەرەڕای گرنگیی و ترسناکیی ئەوەی باسمان کرد، لەمە گرنگتر ئەوەیە کە قورئان شۆڕشێکی بنچینەیی لە بنیاتی هونەریی وێنە باوەکاندا بەرپاکرد، بەجۆرێك بەدروستکردنی چەندین جۆری پەیوەندیی پێشکەوتوو و دوورمەودا و فرەڕەهەند لەنێوان ڕەگەز و لایەنەکانی پێکهێنەری وێنە ڕەوانبێژییەکاندا عەرەبەکانی تووشی شۆك کرد، ئەو پەیوەندییە نوێیانە بەڕووبەرێکی زۆر فراوان سەردەمی خۆیان تێپەڕاندبوو. دوای ئەوەی کە جۆری وێنەکان دیاریکراو بوو، ژمارەیان دیاریکراو بوو، ئەندێشەیان دیاریکراو بوو، پەیوەندیی لایەنەکانیان دیاریکراو بوو، تەنانەت خەریك بوو وێنە ڕەوانبێژییەکان تەنها شیعر بگرنەوە و لەپەخشاندا نەبن، پاش ئەمانە قورئانی پیرۆز هات و لەهەموو ئەم سنور و سنوردارکردنانە دەرچوو و خەیاڵدانی عەرەبی بردە قۆناغ و سەردەمێکی نوێوە و عەرەبی بەیەکجار خستە بەردەم جیهانێکی تەواو لەوێنەگەلێك کە نە شیعر و نە پەخشانیان بەم ڕەهەند و لایەن و پەیوەندییە نوێیانەوە شتی وەهای نەناسیبوو و نەزانیبوو و پێیئاشنا نەبوو.

ڕێسا و یاسا باوەکانی ڕەوانبێژان وا ڕاهاتبوون کە وێنەی ڕەوانکاریی و ڕەوانبێژیی دابەش بکەن بۆ وێنەی پەتی لێکچوو و لایەنی لێکچووێنراو و

ئامڕازی لێکچوواندن و لایەنی لێکچوون، پاشان وێنە لای ئـەوان لقوپـۆپی لێدەبێتەوە بۆ چەندین بەش و دابەشکاریی دیکـە ئـەوەش بـەپێی لابـردن یان باسکردنی لایەنێك یان زیاتر لە لایەنێکی ئەو چوار ڕەگەزە. جا ئەگەر بمانەوێت وێنەگەلی باسکراو لە قورئانی پیرۆزدا بخەینـە ژێـر ئـەو ڕێسـا و ناونیشانە باوانەوە ئەوا لەزۆربەیانـدا دەستەوسـان دەمێنینـەوە. ئـاخۆ چ ڕێسا و یاسایەك دەتوانێت یارمـەتیمان بـدات تـا ئـەم وێنـە قورئانییانـەی خوارەوە شی بکەینەوە:

- (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ)، (لـە تۆڵەسـەندنەوەدا لـەو کەسانەی کـە خەڵك بەناحەق دەکوژن، ژیان هەیە). البقرە: ۱۷۹. (تۆڵەکردنەوە، ژیان)

ـ (ضَـعُفَ الطَّالِـبُ وَالْمَطْلُـوبُ)، الحـج: ۷۳، (داواکـار و داوالێکـراو هەردووکیان لاواز و بێدەسەڵاتن).

- (وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ)، إبراهیم: ٤٣. (دڵەکانیان بەتاڵە). "دڵی بەتاڵ".

- (وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ)، سبأ: ٥٣. (هەر لە دوورەوە باسی نهێنی و شاراوەکانیان دەکـرد و دەمیـان لێـدەدا). (دەمـدان، قسـەکردن، فڕێدانی قسە).

## وێنە فرەڕەهەندەکان:

عەرەبەکان بەدابەزینی قورئانی پیرۆز بۆ یەکەمجار وێنەی فرەڕەهەندیان ناسی و پێیئاشنا بوون، جا کە ڕەوانبێژەکان یاخود زانایانی بواری ڕەوانبێژیی یاساکانی ڕەوانبێژیی عەرەبییان دانا و بەشەکانی وێنەی ڕەوانبێژییان شیکردەوە" هیچ بژاردەیەکیان لەبەردەستدا نەمایەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ وێنە فرەڕەهەندەکانی قورئان تەنها ئەوە نەبێت کە گوێی خۆیان لێخەواند و لەتوێژینەوەکانیاندا پشتگوێیان خست بەپاساوی ئەوەی ناکەونە ژێر ڕکێفی بنەما و یاساکانیانەوە، یان باشتر بڵێین لەبەرئەوەی یاسا مرۆییە سنوردارەکانی ئەوان نەیانتوانی ڕەهەندەکانی ئەو وێنە قورئانییانە بگرنەخۆ و لێیان تێنەگەیشتن. لەوەش مەترسیدارتر ئەوەبوو ئەوکەسانەی کە دەیانویست ڕەخنە لە ئیسلام و لەقورئان بگرن هاتن لەسەیربوون و سەراسیمەیی وێنە قورئانییەکان و دەرچوونیان لەپێوەرە باوەکان ئەو گومانەیان دروست کرد کە ئەمە کەلێنێکە دەتوانرێت لێیەوە دزە بکرێت بۆ تانەدان لە عەقیدە و بیروباوەڕی مسوڵمانان، هەروەك (ئیبن ڕاوەندیی) زەندەقەکاری بەناوبانگ کە ئەمڕۆ هاوبیرەکانی گۆرانیی بەبالای عەقڵە نوێگەرییەکەی دەڵێن کە گوایە ئەو بە بیروبۆچوونەکانی" سەردەمی خۆی تێپەڕاندووە، ئەم کابرایە لەبارەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ) (النحل: ١١٢)، واتە: (خوای گەورە پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە تاڵاویان و پێی چەشتن)، بە(ئیبن ئەعرابی)ی

پێشەوا و شارەزای زمان و ئەدەب دەڵێت: ئایا پۆشاك، دەچێژرێت؟ (ئیبن ئەعرابی)یش پێیدەڵێت: قەیناکات مەیمونی بچووك! وا دابنێ محەممەد هەر پێغەمبەر نەبووە، ئەی عەرەب نەبووە؟. وەك بڵێی (ئیبن ڕاوەندیی) تانەی لەئایەتەکە دابێت کە وا گونجاوترە بوترێت: (فکساها الله لباس الجوع)، یان (فاذاقها الله طعم الجوع)، ئاماژەی بەوەداوە کە بوترێت (خوا پۆشاکی برسێتیی لەبەرکردن)، یاخود (خوا تامی برسێتیی پێچەشتن)، نەك (تالآوی پۆشاکی برسێتیی پێچەشتن)، {تفسیر فتح القدیر للشوکانی: ٣/٢٠٠}. بەلآم وێنە فرەڕەهەندەکە لەوەدایە کە پۆشاکی بەکارهێناوە لەگەڵ تام و چەشتندا و بەوەش وێنەیەکی ڕەوانبێژیی فرەڕەهەندی هێناوەتەبەرچاو کە چۆن پۆشاکێك دەبێتە هۆی چەشتنی ئازاری برسێتی و ترس..

## وێنەی گریمانەیی:

ئەم جۆرەی وێنە ئەو جۆرەیە کە بوار بە ئەندێشەی مرۆڤ دەدات تەواوی بکات، لەبەرئەوەی لێکچووەکە دەخاتە بەردەم شتێك کە هەستە مرۆییە ئاساییەکانمان ناتوانێت درك بەشتە لەوچووەکە بکات، یان ئەو شتەی کە ناسراوە دەچوێنێت بەشتێك کە نەناسراوە یاخود نەبینراوە، نمونەی ئەمە ئەو وێنەیەیە کە سروشتەکەی بووەتە جێی بایەخی زانایانی دێرینی ڕەوانبێژیی، کە تیایدا پەروەردەگار بەرهەمی درەختی (زەقووم)ی ناو دۆزەخ دەچووێنێت بە سەروکەڵلەی شەیتانەکان:

(طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ) الصافات: ٦٥، واتـه: (بـەروبومی ئـەو درەختە دەڵێی سەلكەسەری شەیتانەكانە(لەناشیرینیدا)).

جـا لەبەرئـەوەی كـەسمان هـەرگیز نـە شـەیتانمان دیـوە، نـە سەروسەكوتی، ئیتر ئەم وێنەیە وادەكات دەرگای ئەندێشەی خۆمان ئاوالا بكـەین بـۆ گریمانـەكردنی ئـەو وێنەیـەی كـە ناشـیرینی و قێزەونـی ئـەو درەختـەمان بـۆ بەرجەسـتە دەكـات كـە شـكڵ و شـێوەی بێزراوتـرین و بوغزاوترین دروستكراوی ئەم سەرزەوییەیە. ئەمە، ئەو جۆرە وێنانەیە كـە ئـەو بەربەسـت و سـنورانە تێكدەشـكێنێت كـە وێنـە عەقڵییـە لۆژیكییـە سـنوردارەكان لەبـەردەم ئەندێشـەدا دایـدەنێت و دەبنـە كۆسـپ بـۆ والابوونی، ئیتر بەوجۆرە خەیاڵ خـۆی لەبـەردەم ئاسـۆگەلێكی بێسـنوری وێنا و ڕەنگی بەربلاودا دەبینێتـەوە كـە پێشـتر شـتی وەهـای بەخۆیـەوە نـەبینیوە. ئێسـتاش هەوڵبـدەن بـەهێوریی لەگەڵمـدا چـێژ وەربگـرن و ئەندێشە و هەستەكانتان فراوان بكەن بۆ وێناكردنی هەر وێنەیەك لەم وێنە قورئانییانـەی خـوارەوە، تـا سروشـتی ئـەم وێنـە نوێیـە بدۆزنـەوە و بەدیبكەن:

ـ (لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ)، "بینایـیـەكان درك بـەو زاتـە ناكـەن، لەكاتێكـدا ئـەو زاتـە درك بـەخاوەنی بینایـیـەكان دەكـات و دەیانبینێت"، (چاوەكانی ئەو نابینن، لەكاتێكدا ئـەو هـەموو چـاوەكان و خاوەنچاوەكان دەبینێت).

- (يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ)، "لەڕۆژێکدا ئەم زەوییە دەگۆڕدرێت بەزەوییەکی دیکە و هەروەها ئاسمانەکانیش".

- (وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا)، "دڵی دایکی موسا بەتاڵ بوویەوە"، (دایکی موسا هێندە خەمبار بوو هەستی بەبۆشاییەك دەکرد لەدڵیدا).

- (وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ)، "خۆ ئەگەر بەڕاستی هەچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنووس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندە (و ببنە مەرەکەب و زانست و نهێنیی دروستکراوەکانی خوا بنووسنەوە) ئەوە هێشتا زانست و زانیاریی و فەرمانەکانی خوا هەر تەواو نابێت".

- (وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ)، "هەر هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لەڕۆژی دواییدا، ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن".

- (فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ)، "کاتێك دێت ئاسمان لەت دەبێت و وەك گوڵێکی سوور دێتەبەرچاو".

- (وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ)، "سوێند بەخوا ئێمە ئاسمانی دونیامان کردووە بەچراخان، بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاودەکەین".

- (وَإِنْ يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ)، "بەڕاستی ئەوانەی بێباوەڕ بوون کاتێك کە گوێیان لەقورئان دەبێت نزیکە بەچاوەکانیان هەڵتدێرن".

## جۆرەکانی وێنە لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا:

گەر بگەڕێینەوە بۆ سورەتی (الْمُدَّثِّر)، ئەوا بەلایەنی کەمەوە (٣١) وێنە لەو جۆرە باسکراوانەی وێنە بەدیدەکەین، لەگەڵ جەختکردنەوەمان لەسەر نوێگەریی ئەم وێنانە و نەناسین و نائاشناییان لەلایەن عەرەبەوە پێش ئیسلام، جا چ ئەو وێنانەی کە لەسەر ڕەهەندە ناسراوەکانی وێنە لەپێش ئیسلامدا، بنیات نراون، یاخود ئەو وێنانەی کە لەو ڕەهەندانە دەرچوون، لەگەڵ تێبینیکردنی ئەوەش کە ئەو جۆرە ڕەوانبێژییەی کە لەتەنیشت هەر وێنەیەکەوە باسی دەکەین مەرج نییە جۆری کۆتایی یاخود تاکە جۆر بێت کە وێنەکە تیایدا پۆلێن دەکرێت، چونکە زۆر لەو وێنانە لەدەرەوەی ئەو سنورانەوەن کە زانستی ڕەوانبێژیی عەرەبی دایناون بۆ وێنەی ڕەوانکاریی و ڕەوانبێژیی.

لەو وێنانە، ئاماژە بۆ ئەمانەی خوارەوە دەکەین:

- (وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ)، واتە: پۆشاکت خاوێنڕابگرە، (خوازەیە: مەبەست لە پۆشاك، دەروونی خاوەن پۆشاکەکەیە).

- (سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا)، واتە: ("درکە" کینایەیە، یان هێمایەکە بۆ توندیی سزا، بەبێ دیاریکردنی سروشتی سزاکە).

- (أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ)، واتە: ڕووی وەرگێڕا و خۆی بەزل زانی. (بە "ڕوووەرگێڕان" ئاماژەی بۆ نکوڵی بێباوەڕان کردووە).

- (كَفَرُوا)، واتە: بێباوەڕبوون. (وێنەیەکی ڕەوانکاریی ڕەوانبێژی: باوەڕنەهێنانی چوواندووە بە پەردەیەك کە عەقڵ و ژیریی دادەپۆشێت).

- (يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ)، واته: خوا هەركەسێكی بوێت گومڕای دەكات. (وێنەیەكی ڕەوانكاریی ڕەوانبێژی: بێباوەڕیی چوواندووە بە ونبوون و سەرلێتێكچوون).

- (يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ)، واته: خوا هەركەسێكی بوێت ڕێنموونیی دەكات. (وێنەیەكی ڕەوانكاریی ڕەوانبێژی: ئیمانداری چوواندووە بە گەشتیار، یان كەسێكی هاتوچۆكار).

- (وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ)، واته: سوێند بە بەرەبەیان كاتێك خۆی دەنوێنێت. (وێنەیەكی ڕەوانكاریی ڕەوانبێژی: بەرەبەیانی چوواندووە بە مرۆڤێك كە پەردەی شەو لا دەبات).

- (كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ)، واته: هەموو كەس بارمتەی دەستپێشكەریی خۆیەتی. (وێنەیەكی ڕەوانكاریی ڕەوانبێژی: مرۆڤی چواندووە بە زیندانیكراوێك كە لەپشت شیشی زیندانی كردەوەكانییەوە زیندانی كراوە).

- (أَصْحَابَ الْيَمِينِ)، واته: گرۆی دەستی ڕاستان. (دركە "كینایە"یە لە ئەهلی بەهەشت).

- (التَّقْوَى). (هێما، یان دركە "كینایە"یە لە ترس لەسزای خوا، وەك بلێی خۆپارێزیی دەكرێت بەكردەوەی چاكە).

**بادانەوە "الالتفات" هونەرێکی تایبەت بە قورئان:**

زانایـانی ڕەوانبێـژی زۆر لـەبارەی دیاردەیـەکی زمانەوانییـەوە دواون و خستوویانەتە ناو زانستی گوزارەکاریی "علم المعانی"یەوە و بە هونەری "بادانـەوە" (الالتفـات) ناسـراوە، کـە بریتییـە لـەوەی قسـەکەر کتـوپڕ لەشێوازێکی دووان و قسەکردنەوە قسەکەی بگۆڕێت بۆ شێوازێکی دیکەی دووان و قسەکردن، وەك ئەوەی لە کەسی سێهەمەوە بیگۆڕێت بۆ کەسـی دووەم، یاخود لە کەسی دووەمەوە بیگۆڕێت بـۆ کەسـی یەکـەم، یـان لـە تاکـەوە بـۆ کـۆ.. تەنانـەت ڕەنگـە بـازدان و گواسـتنەوە لـەباری فرمـانی ڕابردوو بۆ ئێسـتا یـان داخـوازیی و، گواسـتنەوە لـە نـاو بـۆ فرمانیشـیان خستبێتە ناو ئەو هونەرەوە. بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێت:

(بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ). (البقرة: ١١٢).

واتە: "هەرکەس بەڕاستی خۆی بداتـە دەسـت خـواو لـەهـەمـان کاتـدا چاکەکارو موسوڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەسـت دەکەوێت و نەترسـیان دەبێـت و نـەغـەم و پـەژارە دایـان دەگرێـت". جـا دیقەت دەدەین زمانی قسەکردن کتوپڕ لەشـێوازی تـاکی سـێهەم (کەسـی سێهەمی تاك) گۆڕدرا: "(فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْـدَ رَبِّـهِ)، ئـەوە پاداشـتی خـۆی لای پـەروەردگـاری دەسـت دەکـەوێـت" بـۆ شـێوازی کـۆی سـێهەم (کەسـی سێهەمی کـۆ): "( وَلَـا خَـوْفٌ عَلَـيْهِمْ)، نـە ترسـیان دەبێـت و نـە غـەم و پەژارە"، سەرەڕای ئەوەی کە مەبەست لەهەردووکیان هەر یەکە.

بەلام، ڕەوانبێژان، زانایانی بواری زانستی ڕەوانبێژی، بەداخەوە کاتێك نمونـەیان بـۆ ئـەم هونـەرە هێناوەتـەوە، لـە سروشـتی ئـەم هونـەرەدا جیاوازییـان نـەکردووە لـەنێوان ئایەتـەکانی قورئـان و شـیعری شـاعیرانی سـەردەمی نەفامیـدا. بـەڵێ ئایەتـەکان لای ئـەوان زاڵـترن بەسـەر نمونـە شـیعرییەکاندا و زۆرتـرن، کـە ئەمـەش داننـانێکی ناڕاسـتەوخۆیە بـە لەپێشـینەبوونی قورئـان لـەم بـوارەدا، بـەلام ئـەم شـیعرانە لـەڕووی زانسـتییەوە شـیاوی ئـەوە نـیین کـە وەك یـەك لەپـەنای یەکـدا لەگـەڵ ئایەتەکاندا دابنرێن وەك نمونەی ئەم هونەری (الالتفات)ـە. لەگەڵمدا ئـەم دوو بەیتە شیعرییە بخوێننەوە کە زانا "السکاکی" لە بەشی "الالتفـات"دا لەکتێبەکەیدا (مفتاح العلوم، ل/٢٩٨)دا وەك نمونە هێناویەتییەوە:

طَحا بِكَ قَلبٌ فِي الحِسانِ طَروبُ بُعَيدَ الشَبابِ عَصرَ حانَ مَشيبُ

تُـكَلِّفُنِـي لَيلى وَقَد شَطَّ وَلِيُّها وَعادَت عَوادٍ بَينَنا وَخُطوبُ

شاعیر: علقمە الفحل (٢٠ی پێش کۆچ مردووە)

ئایا دەتوانین لێرەدا هیچ جۆرێکی هونەری (الالتفات)، یان هەر شـتێك پەیوەندیی بەم هونەرەوە هەبێت ببینینەوە؟ لەڕاستیدا زۆرینەی زانایـانی ڕەوانبێـژی – ئەگـەر نـەڵێین هـەموویان – سـوورن لەسـەر ئـەوەی ئـەم نمونەیە بۆ ئەو هونەرە دەبێت، بەلام بەڕاستی ئێمە هەرچەندە هەوڵمانـدا و زۆرمان کرد کە بگونجێت، جگە لـە قسـەکردنێك لەگـەڵ دەروون هیچـی دیکەمان بەدی نەکرد تیایدا. جا وەك نەریتی شاعیرەکان بـەڵکو تەنانـەت وەك نەریتی هەریەکەمان، ئەم شاعیرە خۆی دەکاتە مرۆڤێك و بـە ڕانـاوی

کەسی دووەمی تاك: (تۆ) (بِكَ) لەگەڵی دەدوێت: (لەخەفەتدا بێ سەروشوێن ماوە دڵی تۆ)، لێرەدا وەك قسەکردنی مرۆڤ لەگەڵ دەروونی خۆیدا وایە و وەك بڵێی کەسێکی دیکەیە و لەبەرامبەریدایە، دواتر شاعیر بادەداتەوە بۆلای خۆی و بە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك (ـم) (تُكَلِّفُنِي) دەدوێت: (لەیلا بەهۆی دوورکەوتنەوەی سەردەم و زەمانەکەیەوە ئازارم دەدات). چەندین جار هەریەکەمان لەگەڵ دەروونی خۆیدا هاوشێوەی ئەم قسانەی کردووە، بۆ نمونە: "ئەوە چیت لێهاتووە بەسسام؟ دڵم ئاسودە نییە لەبارەی ئەوەی کە بەخۆتی دەکەیت. بڕیاری خۆم دەگۆڕم، بەڵێ، ئەمەیان باشترە بۆت بەسسام...". دیقەت دەدەن چۆن لەقسەکانمدا لەگەڵ خۆمدا لە کەسی دووەم (چیت لێهاتووە) گۆڕیم بۆ کەسی یەکەم (دڵم) پاشان جارێکی دیکە بۆ کەسی دووەم (بەخۆتی دەکەیت) و سەرلەنوێ بۆ کەسی یەکەم (بڕیاری خۆم دەگۆڕم) و پاشان بۆجاری سێهەم بۆ کەسی دووەم (باشترە بۆت..).. هەموویشی مەبەستم خۆمە. جا ئایا من لێرەدا مافی ئەوەم هەیە ئەم قسەکردنەی خۆم لەگەڵ خۆمدا ناوبنێم هونەری (الالتفات)؟ ئایا مافی ئەوەم هەیە بیخەمە تەنیشت ئەو هونەرە قورئانییەی کە بەو ناوەوە ناسراوە؟ یان هەر زۆر بەسادەیی ئەوەی ئێمە زۆر لەقسەکانی ڕۆژانەمان دەگرێتەوە و هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەو هونەرە بەرزەی قورئانەوە نییە.

بادانەوە (الالتفات) لەقورئانی پیرۆزدا هونەرێکی تەواو نوێیە و ئەدەبی عەرەبی نە لەپێش قورئاندا و نە لەدوای قورئاندا، شتی وەهای نەزانیوە،

تەنانەت تا ئێستاش ئەو هونەرە دوورە لەوەی قەڵەمەکانمان تاوتوێی بکات و بەکاریبهێنێت، بەڵکو هاوشێوەی ئەو هونەرە لە هیچ زمانێکی دیکەشدا نابینمەوە. جا ئەم هونەرە حاڵەتێکی لاوەکی و کاتی نییە کە بە ڕێکەوت لێرە و لەویَ لەقورئاندا هەبێت، نا، بەڵکو ئەم هونەرە دیاردەیەکی ڕەوانبێژییە کە تەنها قورئان هەیەتی و خاوەنیەتی. جا کە دەشڵێم (دیاردەیە)، ئەوە بۆ ئەوەیە جەخت لەوە بکەمەوە کە چەندە بەچڕیی ئەم هونەرە بەهەموو جۆرە جیاوازەکانییەوە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە. لەگەڵمدا ئەم سێ ئایەتەی سەرەتای سورەتی (الإسراء) بخوێننەوە تا ببینین چۆن ئەو ڕاناوەی کە بۆ خوای گەورە دەگەڕێتەوە شەش دانە جار لە سێ ئایەتدا لەنێوان: (ئەو، من، ئێمە)دا ئالوگۆڕی کردووە:

(سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى (هُوَ) بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا (نَحْنُ) حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّه (هُوَ) هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١) وَآتَيْنَا (نَحْنُ) مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِبَنِي إِسْرَائِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا مِنْ دُونِي (أَنَا) وَكِيلًا (٢) ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا (نَحْنُ) مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا (٣)).

واتە: "پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە (ئەو) شەوڕەویی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا بەبەندەی خۆی محمد {صلى الله عليه وسلم} لە مزگەوتی حەرام، کەعبەی پیرۆزەوە بۆ مزگەوتی (الاقصى) کە دەوروبەریمان (ئێمە) پیرۆزو پڕ بەرەکەت کردووە، تا هەندێك نیشانەو

بەڵگەو دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی (ئەو) زاتە بیسەرو بینایە. (ئێمە) کتێبی تەوراتمان بەخشی بە موسا و کردمانە هۆی هیدایەت و ڕێنموویی بۆ نەوەی ئیسرائیل، بۆ ئەوەی کەسی تر جگە لە (من) نەکەنە پشتیوان و یاریدەدەر بۆ خۆیان. ئەمانەو خەڵکی تریش نەوەی ئەو کەسانەن کە لە کەشتیەکەدا لەگەڵ نوح دا هەڵمانگرتن (ئێمە) تا سوپاسگوزار بن و قەدری نازو نیعمەت و بەخششەکان بزانن، چونکە بەڕاستی نوح بەندەیەکی زۆر سوپاسگوزار بوو".

### بادانەوە (الالتفات) لە کات و زەمەندا:

لەڕاستیدا چەندین جۆر هونەری (الالتفات)ی قورئانی هەن، یەکێك لەوانە: چوون بەناویەکی کات و زەمەنە، بەوەی کە "ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو" لەیەك کات و زەمەندا یەکدەگرن. ئەوە، ڕەهەندە تایبەتییە ئیلاهییەکەی کات و شوێن (زەمان و مەکان)ــە، کە ناچنە ژێر ڕکێفی پێناسی مرۆییانەی ئێمەوە. دەستەواژە قورئانییەکان ئاساییانە لەنێوان سێ کات و زەمەنە مرۆییەکەی ئێمەدا دێن و دەچن بەبێ گوێدانە پێوەرە دنیاییەکانی ئێمە، بەوەش لە کۆتوبەندەکانی ئێمە ڕزگار دەبن و لەو ڕەهەندانەی کە ئێمە لە بیر و زەینی سنورداری خۆماندا کێشاومانن، دەردەچن. با لەسەر ئەم ئایەتانە هەڵوێستە بکەین، تا ببینین چۆن سنورەکان ون دەبن و لەنێوان "ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو"دا بەیەکدا دەچن:

- (وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا)، الانعام: ٢٧. واته: "جا ئەگەر ئەوانە ببینی لە قیامەتدا لەسەر لێواری دۆزەخ ڕاوەستێنراون، جا دەڵێن: خۆزگە جارێکی دیکە بیانگێڕاینایەتەوە بۆ دونیا ئەوسا هەرگیز نیشانە و بەڵگە و ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەدەزانی..". ماناکەی بەپێوەری ئێمە ئەمەیە: لەئایندەدا لەسەر لێواری دۆزەخ "دەوەستێنرێن" و ئەوانیش دەڵێن:...". کە ئایەتەکە بە شێوەی "فرمانی ڕابردوو" هێناویەتی.

- (وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)، الانعام: ٧٥. واتە: "بەوشێوەیە دەسەڵاتی تۆکمەمان لەئاسمان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین"، واتە: نیشانمان دا، چونکە ڕووداوەکە ڕابردووە، نەك ئێستا.

- (وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ). هود: ٣٧. واتە: "نوح کەشتییەکە دروست دەکات.."، واتە: دروستی کرد، چونکە ڕووداوەکە ڕابردووە، نەك ئێستا. (ئەمانە بۆئەوەن کە دیمەنەکە بهێنێتە بەر چاوی خوێنەر و وەك بڵێی ئێستا ڕوودەدات و خوێنەر، لەهەمانکاتدا بینەری ڕووداوەکەیشە).

## بادانەوە "الالتفات" لەحاڵەتی ئیعرابی (النصب)دا:

لەناو گشت جۆرەکانی بادانەوە (الالتفات)ی قورئانیدا، ئەو جۆرەی کە زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێت، ڕەنگە ببێتە مایەی سەرسامیشمان، ئەو جۆرەیە کە دەتوانم ناوی بنێم: (الالتفات النحوی)، واتە: (بادانەوەی ڕێزمانی)، کە ئەم جۆرە بەشێوەیەکی تایبەت لەحاڵەتە کتوپڕەکانی "النصب"دا ڕووبەڕووی خوێنەر دەبێتەوە، کە ئەم حاڵەتە بەدرێژایی سەردەمەکان تەنانەت شارەزایانی زمانی عەرەبیشی شڵەژاندووە، ئەوان وەك مامەڵەکردنەکانی دیکەیان بۆ ئەو حاڵەتە قورئانییانەی کە ناچنە ژێر ڕکێفی ڕێسا مرۆییە کەموکورتەکانیانەوە هاتوون هەوڵیان داوە پاساوی ڕێزمانیی بۆ ئەم جۆرە (الالتفات)ـەش بدۆزنەوە، تەنانەت بۆ ئەو مەبەستە هەندێکجار ناچاربوون لەمانای ڕاستەقینەی ئایەتەکان دووربکەونەوە.

مەبەست لە (حاڵەتی النصب) ئەوەیە کە لەزمانی عەرەبیدا وشەکان بەگشتی، لە چوار حاڵەتی ڕێزمانی لەناو ڕستەدا دێن: المرفوع، المنصوب، المجرور، المجزوم، ئەم باسەی ئێستامان حاڵەتی (المنصوب) دەگرێتەوە.

جا تا زانایانی ڕێزمان دەگەنە شێوازێکی ڕێزمانیی هەمیشەیی بۆ ئەم جۆرە (النصب)ـە، ئەگەریش بگەن، ئەوا ئێمە پێشنیاز دەکەین لەجیاتی ونبوون لەناو کەندوچاڵی ڕێزمانییدا، بەشێکی تایبەتی لە ڕێزماندا بۆ دیاریبکرێت بەناونیشانی "المنصوب القرآني"، یاخود " النصب الالتفاتي". بەڵام بۆ ئەو خۆرهەڵاتناسە بەدگومانانەی کە بانگەشەی ئەوە

دەکەن ئەو حاڵەتانەی "بادانەوە ڕێزمانی"یانەی لەقورئاندا هاتوون، "هەڵە"ن و هیچی دی، ئەوا بۆ بەرپەرچدانەوەی تۆمەتەکانیان و تۆمەتی گشت بەدگومانێك، ئەوە بەسە ئەم خاڵانەی خوارەوە بخەمەڕوو:

یەکەم: قورئانی پیرۆز لەڕێزمانی عەرەبی لەپێشترە، دێرینترە، بەڵکو قورئان هاندەربووە بۆ زانایانی ڕێزمانی عەرەبی و زمانەوان و زانایانی ڕەوانبێژیی تا ڕێساکانیان دابنێن، بەبێ قورئان نەیاندەتوانی ڕێساکانی خۆیان لەو سەردەمە زووەی تەمەنی زمانی عەرەبیدا دابنێن، قورئان چاودێر و باڵادەستی ئەو ڕێسایانە بوو، نەك ڕێساکانی ئەوان چاودێر و باڵادەستی قورئان بێت.

دووەم: ئەگەر محەممەد (سەلامی خوای لێبێت) لەقورئاندا هەڵەی کردبێت، کە بەدگومانان هەمیشە دەیجوونەوە کە ئەو قورئانی داناوە، ئەوا بۆچی محەممەد لە فەرمودەدا هەڵەی نەکردووە؟ ئایا لە فەرموودەکانیدا وردتر و وردبینتر بووە لە قورئانەکەی، لە کاتێکدا قەبارەی فەرموودەکانی زیاترە لە (دە) هێندەی قەبارەی قورئان، هەروەها سەرەڕای ئەوەی کە فەرموودەکانی بەرهەمی قسەی ڕۆژانە و ئاساییانە و قسەدەستبەجێ و خێراکانی بووە لەگەڵ خەڵکیدا؟ ئایا زمانی قسە دەستبەجێکانی کە لەگەڵ خەڵك کردوونی بێ هەڵە بووە بەڵام کاتێك کە تەنها بووە و دوور لەچاوی خەڵك بووە و بەوردی دانیشتووە بۆ نوسینی دەقێك کە دوای کەمێکی دیکە دەبێت بیخاتە پاڵ خواکەی و

بلێت ئەوە قسەی ئەوە، لەمەیاندا دەقەکەی پڕ بووە لەهەڵە؟! شتی وەها ڕێی تێدەچێت؟!

سێهەم: ئەگەر هەر بەڕاست هەڵەیەك هەبووبێت، ئەوا هاوەڵانی پێغەمبەر لە شاعیر و ڕەوانبێژ و زمانپاراوان نەیاندەتوانی درکی پێبکەن و هەڵەکە ڕاست بکەنەوە و بەوەش قورئان بە دروستی و بێ هەڵە دەگەیشتە دەستمان؟ بەڵکو، تەنانەت لەوە گرنگتر، ئایا بوونی ئەو هەڵانە بەس نەبوو بۆئەوەی ئەو هاوەڵانە لە ئاینە نوێیەکە پاشگەز بکاتەوە چونکە خوای ئەو ئاینە تازەیە لە سادەترین یاسا و ڕێسای نووسیندا "هەڵە" دەکات؟!

چوارەم: زۆربەی زۆری حاڵەتەکانی بادانەوە (الالتفات)ی ڕێزمانیی قورئان، ئەگەر کار بە بنەمای "بوونی هەڵە" بکەین، ئەوەندە ڕوون و دیارن کە وەك ئەوە وایە لەحاڵەتی (المبتدأ و الخبر) (نیهاد و گوزارە)دا هەڵە بکەین، بۆ نمونە لەجیاتی ئەوەی بوترێت: (الشمسُ مشرقةٌ)، کە هەردوو وشەکە پێویستە (مرفوع) بن و حەرەکەی (الضمة)یان هەبێت، بوترێت: (الشمسَ مشرقةٌ)، بێین حاڵەتی (النصب) بدەینە وشەی یەکەم و حەرەکەی (الفتحة)ی بدەینێ، کە ئەمە تەنانەت کەسی سەرەتا لە فێربوونی زمانی عەرەبیدا هەڵەی وا ناکات، ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەنمونە وەردەگرین:

- (خَالدينَ فيهَا أَبَدًا وَعْدَ اللَّه حَقًّا)، النساء: ١٢٢.
- (فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّه بِهِ)، الانعام: ١٤٥.

- (وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ)، هود: ٦٩.
- (ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ)، مريم: ٣٤.
- (إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً)، الانبياء: ٩٢.
- (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ)، الحج: ٧٨.
- (سَلَامٌ قَوْلًا مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ)، يس: ٥٨.
- (كَلَّا إِنَّهَا لَظَى، نَزَّاعَةً لِلشَّوَى)، المعارج: ١٥-١٦.
- (وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ)، المطففين: ٢٧-٢٨.
- (سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ، وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ)، المسد: ٣-٤.

لەکۆتاییدا، بوونی بەلایەنی کەمەوە (١٥) شوێنی بادانەوە (الالتفات) بەجۆری جیاوازەوە، لەسورەتێکی کورت و زوودابەزیوی وەك سورەتی (الْمُدَّثِّر)دا، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر قەبارەی ئەم دیاردەیە و گرنگییەکەی لەنێوان دیاردە نوێیەکانی ناو قورئاندا، هەروەها بەڵگەی قەبارەی ئەو شۆکە زمانەوانی و ڕەوانبێژییەیە کە تاکی عەرەبی تووشی بوو کاتێك بۆ یەکەمجار گوێبیستی وشەکانی نیگا و سروشی خوایی بوو.

## زمانی کراوه و واتافراوان:

قورئان، سورپرایزی بۆ عەرەب بریتی بوو لە جۆرێکی دیکەی زمانی فرەڕوو، فرەڕەهەند، بەبێ ئەوەی دژیەکی لەنێوان ئەو ڕووانەدا ڕووبدات. ئەم زمانە ئاسمانییە نەرمە، توانی لەگەڵ تێپەڕبوونی سەردەمدا و لەگەڵ هەموو سەردەمێکدا بەردەوامیی بەخۆی بدات و زیندوو بمێنێت، و مرۆڤایەتی هەر ڕۆژە ماناگەلێك تیایدا بدۆزێتەوە کە ڕاستییەکانی سەردەمەکەیان و کۆزانیاریی زاناکانیان ڕێگەیان بەدەرخستنیان نەدابێت، ئیتر بەوجۆرە نەوەی هەر سەردەمێك و ڕەنگە خەڵکی هەر زەمین و کەلتورێك بەپێی فیکر و دۆزینەوەکانی خۆیان و زانستی سەردەمەکەیان تێیگەیشتبن. پێویستە دان بەوەدا بنێم کە من درەنگانێك درکم بە دانایی و حیکمەتی ئەوە کرد کە عومەری کوڕی خەتتاب ڕێگەی نەدەدا خەڵك تەفسیری قورئان بکەن یاخود پرسیار لە ماناکانی بکەن، بەجۆرێك هەندێکجار کار گەیشتووەتە لێدان و تەمبێکردنیان و زیندانیکردنیان. بۆ نمونە: ئەبو عەدەببەس دەڵێت: لای عومەری کوڕی خەتتاب "خوا لێی ڕازی بێت" دانیشتبووین، پیاوێك هات بۆلای، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! "الجوار الكنس" چییە؟ عومەر، بەگۆچانێك کە پێیبوو مێزەرەکەی سەری کابرای فڕێدا و وتی: تۆ حەروریت؟ سوێند بەو خوایەی گیانی عومەری کوڕی خەتتابی بەدەستە ئەگەر جارێکی دیکە بتبینم قژت تاشیوە "سەرت کەچەڵ کردووە" ئەوا ئەسپێ لەسەرت دەردەکەم واتە

سەرت دەپەڕێنم. {بۆ نمونەی زیاتر لەمبارەوە سەیری "جامع الاحادیث للمسانید والمراسیل"ی ئیمامی سیوطی بکە، بەشی/٢، ل/١٤٣-١٤٥}.

لەڕاستیدا ئەوەی کە هاوەڵان بێن تەفسیر و لێکدانەوەیەك بۆ قورئان لەو سەردەمەی پێغەمبەرایەتی و هاوەڵاندا دابنێن، ئەوە بەتێگەیشتنی کەموکورتانەی ئێمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەڵێ سامانێکی باشی کلیلی ئاڵتونیی لەبەردەستماندا دەبوو بۆ چوونە ناو جیهانی نهێنییە زمانەوانییەکانی قورئانی پیرۆز، بەڵام ئەمە لەچاوی پیاوێکی دروستبینی عومەردا خوا لێی ڕازی بێت مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئیتر دوای ئەوە دەرگای ژیریی و عەقڵی خەڵك دابخەیت و سنور بۆ بۆچوون و ئیجتیهادات و دۆزینەوەی نهێنییەکانی قورئان و پەرچوو "موعجیزە"کانی دابنێیت و قفڵی بکەیت، لەکاتێکدا قورئان ئەو کتێبەیە کە وەك پێغەمبەری سەروەرمان سەلامی خوای لێبێت ئاگاداری کردووین "لا تنقضي عجائبه"، "بابەتە سەرسامکەرەکانی تەواو نابن". جا کێ بوێری ئەوەی دەبێت دواتر، تەنانەت لەسەدەی دووەمی کۆچیدا، پێشنیازی لێکدانەوە و تەفسیرێکی نوێ بکات بۆ هەر ئایەتێك کە پێشتر لێکدانەوە و تەفسیرێکی دیکەی لەسەدەی یەکەمی کۆچیدا و لەسەردەمی هاوەڵێکی بەڕێزی وەك عومەردا بۆ دانرابێت، ئەی ئەبێت چۆن بێت ئەگەر عومەر خۆی ئەو تەفسیر و لێکدانەوەیەی بیستبێت و پاشان بێدەنگ بووبێت لێی؟

لەڕاستیدا ئەو "دۆزینەوە زۆروزەبەندانەی ئیعجازی زانستیی" کە چەندین سەدەی دوورودرێژ نهێنییەکانیان لەژێر باڵی ئەم زمانە کراوەیەدا

مانەوە، یەك دانەیە لەبەروبوومی ئەو تایبەتمەندییە زمانەوانییـەی کتێبەکـەی پـەروەردگار، هــەروەها بەرهــەمی ئــەو پارێزگاریکردنــەی هــاوەڵانی بــەڕێزە لەقورئانی پیرۆز کە بەبێ شیکردنەوە و لێکدانەوە و تەفسیرکردنی، بۆ دوای خۆیان بەجێیانهێشت. دەتوانرێت بوترێت کە ئـەو جـۆرە وشـە و گوزارشـتانە نزیکە تەنها لـەو ئایەتانـەی قورئانـدا بـەدیبکرێن کـە بـەزاراوەی "الـمُتَشابە" گوزارشـتیان لێدەکرێت نـەك لـەو ئایەتانـەی کـە پێیانـدەوترێت "الـمُحکم"و ئایــەتی عەقیــدە و یەکتاپەرســتین. ئاســانە بــۆ لێکــدەرەوانی قورئـــان "موفەسسیرین" کە ڕاجیا بن بۆنمونـە لـەمانای وشـەی (الصـمد)ی قورئـانیی واتاکراوە و واتافراوان لەسورەتی "الاخلاص"دا: (اللّـهُ الصَّـمَدُ)، لەبەرئـەوەی مانا گریمانەییەکانی سەرەڕای فرەییان، لە ناواخن و ناوەرۆکی یەکتاپەرستی نایترازێنێـت، بــەڵام هــیچ بوارێــك نییــە بــۆ جیــاوازیی و ڕاجیــایی یــاخود فرەگریمانـەیی مانـا لەوشـە و دەسـتەواژەکانی دیکـەی پـێش یـان دوای ئـەو وشەیەدا: (أَحَدٌ ، لَـمْ یَلِـدْ ، وَلَـمْ یُولَـدْ)، لەبەرئـەوەی شـتەکە لێرەدا دەچێتە کرۆکی یەکتاپەرستی و چەندێك سەدە و سەردەمەکان تێپـەڕبن و شـوێنەکان جیاواز بن و کەلتورەکان جۆراوجۆر بن بـەهیچ جۆرێك مشـتومڕ هـەڵناگرێت و فرەبۆچوونی و فرەواتایی قبوڵ ناکات.

هــەروەها دەســتەواژەی (الله أکــبر) نمونەیــەکی نزیکەبەردەســتە بــۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستمان لەزمانی کـراوە و فرەواتـا. ئـەم دەسـتەواژەیە هەمیشە بەم شێوەیە بۆ زمانی ئینگلیزی وەردەگێڕدرێت: ( ALLAH is the greatest ،great (ALLAH is)). (خــوا گەورەیــە)، (خــوا گەورەترینــە)، بــەڵام هــیچ کــام لــەو دوو ڕســتەیە وەرگێڕانێکــی وردی

دەستەواژەی (الله أكبر) نییە، لەبەرئەوەی وشەی "أكبر" لەزمانی ئینگلیزیدا بەرامبەرە لەگەڵ وشەی (greater)، کەواتە وەرگێڕانی دروستی ئەو دەستەواژەیە بریتییە لە (ALLAH is greater). ئیسلام ئەو دەستەواژەیەی سەرەڕای سەرپێچیکردنی نەریتە زمانەوانییەکانمان کە پێویست دەکات لەدوای (اسم التفضيل)ی (أكبر)ـەوە وشەی (مِن) (لە) بێت، (خوا گەورەترە لە...)، بەڵام ئاوا بەکراوەیی جێیهێشتووە، تا ڕێگە بدات ئەو کەسەی ئەو دەستەواژەیە دەڵێتەوە بەپێی بارودۆخی خۆی چ وشەیەك پێویست دەکات گریمانەی بکات: (الله أكبر) (خوا گەورەترە)... لەهەموو شتێك، لەهەموو دڵتەنگییەك، لەهەموو خۆشییەك، لەهەموو خەموخەفەتێك، لەهەموو ئارەزوویەك، لەهەموو ستەمکارێك... هتد. جا ئەگەر لەجیاتی (أكبر) وشەی (الأكبر)، یاخود (كبير) بوایە ئەوا دەستەواژەکە دادەخرا و لەگەڵ کۆتاییهاتنی وشەکانیشی ئەمیش کۆتایی دەهات و دەوەستا و بواری ئەوەی پێنەدەداین خۆمان ئەندێشەمان بخەینە کار و خەیاڵمان هەناسە بدات یاخود فیکرمان تیایدا بکەوێتە جوڵە. پێویستە ئاماژەبەوە بدەین بەداخەوە بەڕاستی ئولفەتگرتنمان و ڕاهاتنمان بە دەستەواژەکە توانای ئەوەی لێسەندووین جوانترین نوێگەری و ناوازەیی و کرانەوەی ئەو دەستەواژەیە بەدی بکەین، وامان لێهاتووە ئێستا وەها ئەو دەستەواژەیە دەڵێینەوە وەك بڵێی (الله كبير)، (خوا گەورەیە) نەك (الله أكبر) (خوا گەورەترە)، لەمەشەوە لادان و هەڵە لەوەرگێڕانیدا بۆ زمانەکانی دیکە سەریهەڵدا.

باشترین پێوەر بۆ زانینی دەستەواژە یان ئەو وشانەی فرەڕەهەندن، بریتییە لە "ئیعراب – شیکردنەوە"، چەندێك ئەگەری ئیعرابکردنی وشەیەك یان دەستەواژەیەك زیاتر بێت هێندەش پڕشنگدانەوە و فرە واتاییەکەی زیاتر دەبێت و دەوڵەمەند دەبێت بە سێبەر و ئاماژە و ڕەنگە جۆربەجۆرەکان. قورئانی پیرۆز شیعر و زمانی ئەدەبیی سەردەمی دابەزینی تێپەڕاند و بە هێنانی زمانێکی نوێ سورپرایزی بۆ عەرەبەکان کرد، زمانێك بتوانێت وەڵامی ئاڵوگۆڕەکانی سەردەم و نوێبوونەوەی ڕووداوەکان و جیاوازیی دەروونەکان و پێشوەچوونی فیکری مرۆیی کەلتور و زانست و دۆزینەوەکانی مرۆڤ بەپێی سەردەمەکان، بداتەوە، بەوەش خەڵکی، هەریەکە و لەسەردەم و ژینگە و شوێنی خۆیدا ئەوەندەی لێ هەڵبگۆزێت کە چەمك و کەلتوری پێویستییەتی و بۆ سەردەم و شوێن و فیکر و پێویستییەکانیان بگونجێت، بەبێ ئەوەی سەرەڕای جیاوازییان و جیابوونیان هیچ دژیەکییەك لەو چەمکانەدا ڕووبدات. گومان لەوەشدا نییە کە ئەو دەوڵەمەندییەی قورئان بەم جۆرە وشە و یەکە زمانەوانییە فرە ڕەهەندانە دەرگایەکی فراوانی لەبەردەم عەرەبدا کردەوە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەدەب و شیعر و هۆنراوەکانیان بەم زمانە دەوڵەمەندە نوێیە.

بەڵام دەقە ئاسمانییەکانی دیکە، تەورات و ئینجیل، ئاسانە بتوانین نمونەی لەم چەشنەی زمانی کراوەیان تێدا ببینینەوە، بەڵام دەستەوسانین لەوەدا بتوانین بڕیارێکی بابەتییانەی دروست بەشێوەیەکی

گشتگیر لەسەری بدەین، لەبەرئەوەی زۆرینەی دەقەکانی ئەو دوو کتێبە کە لەبەردەستماندایە مرۆڤ یاخود زۆر بڕۆین پێغەمبەران گێڕاویانەتەوە، دەگمەن دەقێکیان تێدا مابێت کە خوای گەورە خۆی فەرمووبێتی، کەوابێت بەگشتی ئەو زمانە بەتەواویی زمانی ئاسمانیی نییە، بەڵکو لەباشترین حاڵەتدا لێکدانەوە و تەفسیری زمانە ئاسمانییەکەیە. پاشانیش لەلایەکی دیکەوە ئێمە ئەو دەقە ئاسمانییانەمان بەزمانە بنەڕەتییەکەی خۆیان کە پێی دابەزیوە، لەبەردەستدا نییە، وەرگێڕان چەندێك ورد بێت تەنها و تەنها لێکدانەوەیەکی تاکەکەسییە و گوزارشت لە گۆشەنیگای وەرگێڕ دەکات ئەویش سنورردارانە لەو دەقەدا کە وەریگێڕاوە، هەروەها وەرگێڕانەکان زۆرجار لەبەردەست کەسی وەرگێڕدا دەشڵەقێن، تێکدەچن، بەتایبەتی ئەگەر دەقەکە خۆی هێندە ورد و بابەتی و دڵسۆزانە بێت بەجۆرێك وەرگێڕ دەستەوسان بێت کە ئەو بەشانەی کە ناڕوونن بە زمانێکی زانستیی ورد و ڕوون دابڕێژێتەوە، ناچار پەنا بباتە بەر شێوازێکی سەرسامانەی وەها کە ناڕوونییەکە بخاتە ناو دەقە وەرگێڕاوەکەشەوە تا نزیکبێتەوە لەوەی کە ئێمە پێمانوایە زمانی کراوە و فرەواتایە. زیاد لەوەش جیاوازییە ڕێزمانی و وشەسازی و کەلتورییەکانی نێوان زمانەکان ئاستەنگ دروست دەکەن لەبەردەم وەرگێڕدا کاتێك دەیەوێت واتا لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکەی خاوەن یاسا و ڕێسا و کەلتور و نەریتی جیاواز، بگوازێتەوە.

بۆ نمونە، ماڤی خۆمانە دوودڵ بین لەبڕیاردان بەسەر ئەم دەقە تەوراتییە نارِوونەی خوارەوەدا: (أسّسْتَ حَمْداً بِسَبَبِ أضْدادِك) {مزامیر: ٨: ٢، چاپی دار الکتاب المقدس فی العالم العربی، ١٩٨١}، "ستایشێکت بەهۆی دژیەکییەکانتەوە دامەزراندووە" کە بڵێین ئەمە دەقێکی کراوەی هەڵگری فرەواتایە، کە ئەگەر سەیری دەقە ئینگلیزییەکەی هەمان دەستەواژە بکەین دەبینین دەستەواژەیەکی داخراوە و دوو ڕووکار هەڵناگرێت:

.(Thou ordained strength because of thine enemies)

(The holy book, King James Version. Collins, clear-type press, London: 1950)

وەرگێڕانەکەی، کە وەرگێڕانێکی خۆمە و وەرگێڕانی تاکەکەسییش خراپیی خۆی هەیە، دەبێتە ئەمە: "دوژمنانت هێزیان پێداویت". بەڵام هەمان دەستەواژە لەچاپی (دار الکتاب المقدس في الشرق الأوسط. لبنان: ٢٠٠٤)دا بەم شێوەیە هاتووە: "بەڕووی دوژمنانتدا بەهێز بوویت" کە ئەمەیان وەك دیارە نارِوونیی لەچاپە عەرەبییەکەی سەرەوە کەمترە، بەڵام ئەمیش لەدەقە ئینگلیزییەکە نارِوونترە. ئێمە لەقورئانی پیرۆزدا کە خوای گەورە خۆی لە یەکەم ئایەتەوە تا کۆتا ئایەت دەدوێت، ڕووبەڕووی ئەم جۆرە کێشانە نابینەوە، پاشانیش دەقە بنەڕەتییە یەکەمەکەی قورئان وەك خۆی لەبەردەستماندایە بەبێ ئەوەی پێویستمان بەزمانێکی نێوەندگیر یان زیاتر هەبێت وەك ئەوەی لە کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەدا دەبینرێت.

## پێگە کرانەوەییەکان لەسورەتی (الـمُدَّثّر)دا:

تا ئێستا لەم توێژینـەوە شـیکارییەماندا بـۆ لایەنـە زمانەوانییـە نوێیـە جۆربەجۆرەکانی قورئان، کارمان لەسەر سورەتی (الْـمُدَّثِّر) کـردووە، جـا ئەگـەر بمانـەوێت ئـەو وشـە و دەسـتەواژە کرانەوەییانـەی ئـەم سـورەتە دیاری بکەین کە لەناو هەموو پێگە نوێگەرییەکاندا ئەمانەی ئـەم سـورەتە زۆرترین مشتومڕیان وروژاندووە لای لێکدەرەوە و موفەسسـیر و زمانـەوان و زانایـانی ڕێزمـانی عـەرەبی، بەتایبـەتیش ئەگـەر بابـەتی (قیرائـات) و فرەخوێندنـەوە و بابـەتی (الناسـخ والـمنسوخ)یشی بخەینـە سـەر، ئـەوا دەتوانین بەلایـەنی کەمـەوە (٢٩) پێگـە، لـە وشـە و دەسـتەواژە، دیـاری بکەین، کە ئەمانە هەندێکیانن:

(قُمْ فَأَنْذِرْ – وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ – وَالرُّجْزَ فَاهْجُر – وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ – وَبَنِينَ شُهُودًا – وَمَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيدًا – كَلَّا – لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ – لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ – إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ – نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ – أَنْ يُؤْتَى صُحُفًا مُنَشَّرَةً – هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى).

جا دەتوانن لەسەر هەر وشەیەك یان دەستەواژەیەك هەڵوێستە بکـەن، یەك بەیەك لێیـان ورد ببنـەوە، تـا خۆتـان ئـەو چـەندین ڕەهەندانـە ڕوون بکەنـەوە کـە هـەر یـەکێك لـەو وشـانە هەڵیـدەگرێت، هـەر لەیەکـەم دەستەواژەوە: (قُمْ فَأَنْذِرْ)، کە وشەی یەکەمی، واتە فرمانی (قُمْ) چەندین مانای گریمانەیی هەڵدەگرێت: ئایا مانای "هەستان"ـە، یان جوڵەیە، یـان ئامـاژەیـە بـۆ دەسـتکردن بـە کـار، یـان خۆحـازرکردن و ئامادەباشـییە؟

هەروەها فرمانی (فَأَنْذِرْ) کە لەوانەیە ئەم مانایانە بگەیەنێت: پەیامەکە بگەیەنە، یان: ئاگاداری خەڵك بکە بەنزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی، یان: ئاگاداری خەڵك بکەرەوە بەسزای دنیایی، یاخود: ئاگاداری خەڵکی بکەرەوە بە ئاگر و مانەوەی هەمیشەیی تیایدا... بەمجۆرە تا دەگەیتە دەستەواژەی کۆتایی: (هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى) کە وشەی (أَهْلُ) چەندین مانای جۆربەجۆری لەخۆگرتووە: خاوەن شت، یان بەخشەری شت، یان شایستەی شتەکە، یاخود سەرچاوەکەی، هەروەها وشەی (التَّقْوَى) کە چەندین مانای واتایی جۆربەجۆر هەڵدەگرێت: لەوانەیە بەمانای خۆپارێزی بێت، کە مەبەست لێی خۆپارێزیی ئێمەیە لەڕۆژی دواییدا لەسزای خوا بە باوەڕهێنانمان پێی، دەشکرێت بەمانای پارێزگاریی و پاراستن بێت، واتە: خوای گەورە خەڵکی لەسزا دەپارێزێت ئەگەر باوەڕی پێبهێنن، یاخود دەیانپارێزێت لەخراپییەکانی دونیا..

بوونی ئەو ڕێژە زۆرەی پێکە کرانەوەییەکان (هەڵگری فرەواتاکان) لەسورەتی (الْمُدَّثِّر)دا بیرۆکەیەکی نزیکەییمان دەداتێ لەبارەی مەودای زاڵبوونی ئەم جۆرە وشە و دەستەواژە کرانەوەییانە بەسەر زمانی قورئانی پیرۆزدا لەسەرجەم سورەتەکانیدا، هاوکات جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە کرانەوەی ئەم زمانە و هەڵگری فرەواتایی مانای ئەوە ناگەیەنێت کە کەلێنێکی مەترسیدار لەقورئاندا هەیە و بوار دەدات بە کەسانێك مەبەستێکیان هەبێت تا واتاکەی بگۆڕن، و بەدرێژایی سەردەمەکانیش کەسانێکی وەها هەبوون و ئەوەیان کردووە و تائێستاش

هەر دەیکەین، نا، بەڵکو ئەمە، تایبەتمەندییەکە ئەم واتایانەی دەوڵەمەند کـردووە و پـاراویی و زینـدویی و واتابەخشـینی بەدرێـژایی ئـەم چـەندین سەدەیە و بەتێپـەڕبوونی بەرەوپێشچوونی کۆزانیـاریی مـرۆڤ و جیـاوازیی ژینگە و کەلتورەکەی، زیاتر کردووە.

## فرەیی لەخوێندنەوەی قورئان (قیرائات) و کرانەوە و فرەواتایی:

لەڕاسـتیدا بابـەتی فرەیـی لەشـێوازی خوێندنـەوەی قورئانـدا کـە پێیـدەوترێت (قیرائـات) یەکێکـە لەسەراسـیمەترین ئـەو شـتانەی کـە قورئـان لەبواری زمـانی کـراوە و فرەواتاییـدا پێشکەشـی کـردووین، بـەجۆرێك — وەك پێشتریش جەختمان لەسەر کردەوە — هـیچ کتێبێکـی دیکـە تـا ئێسـتا مـرۆڤ ناسـیبێتی شـتی وەهـای بـەخۆوە نـەدیوە. جـا خۆرهەڵاتناسـەکان و شـوێنکەوتووانیان ژاوەژاوێکـی گـەورەیان لـەبارەی ئـەم لایەنـە ئیعجازییـەی زمـانی قورئـان بـەرپاکرد و توێژینـەوەی دوورودرێـژیان بـۆ تـەرخان کـرد، لەپێناویدا زەماڵەی دەسـتواڵای خوێنـدنیان تـەرخان کـرد بەئومێـدی ئـەوەی دەرچەیەك بۆ گومانەکانیان یاخود کـەلێنێك بـۆ خـەیاڵپڵاوییان بدۆزنـەوە کـە بتوانن لێیەوە گورز لە ڕاستییەتی قورئـان و سەرچـاوەکەی بوەشـێنن، بـەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بێت هەڵوێستە بکەن و لەگەڵ ویژدانی خۆیان و بنـەما و پەیڕەوە زانستییەکانیاندا کە ئێمەی خۆرهەڵاتی شتی زۆری لێـوە فێربـووین، بوەستن و لەڕێی ئەو پەیڕەوە زانسـتییانەدا بگەنـە ئـەو ئەنجامـەی دان بنـێن بـەوەدا فرەیـی خوێندنـەوەی قورئـان (قیرائـاتی قورئـان) تـەنها و تـەنها لایەنێکی ئیعجازیی دیکەیە لە زمانی ئەم کتێبە سەرسوڕهێنەرەدا.

هەرگیز بیستووتە چەند کتێبێك لە یەك کتێبدا هاتبێت، بیستووتە چەند شێوە دەقێك لە یەك دەقدا کورت کرابێتەوە، بەجۆرێك ئەم دەقە بتوانرێت بە زیاتر لەشێوازێك بخوێنرێتەوە، یاخود هەڵگری زیاتر لە واتایەك بێت، بە بێئەوەی هیچ دژیەکی یان دوورییەك لەنێوان ئەو واتایانەدا دروست ببێت سەرەڕای جیاوازیی و فرەییان؟ شتی وەهات بەرگوێ کەوتووە؟ بابەتەکە پەیوەندیی بە ڕاجیایی نێوان مسوڵمانانەوە نییە، بەڵکو ئەوە ڕێگا و شێوازی جۆراوجۆرە بۆ خوێندنەوەی و ئاوا لەئاسمانەوە دابەزیوە بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی زمانی قورئان و زەنگینکردنی واتاکانی و ئاسانکردنی خوێندنەوەی و پشتگیریی لایەنی کرانەوە و فرەواتایی زمانەکە تا لەگەڵ گۆڕانی کات و شوێندا بگونجێت، هەروەها زیادکردنێکی دیکەی لایەنە ئیعجازییەکانییەتی کە ئەم قورئانە جیاواز لە هەر کتێبێکی دیکە، بەهۆیەوە ناوازە و تاقانە بووە، واتە: تەنها و تەنها قورئان خاوەنی ئەم تایبەتمەندییەیە کە یەك دەق بەچەندین شێوە و واتای جۆربەجۆر بخوێنرێتەوە بێئەوەی دژیەکیی دروست بکات.
ئەگەر ڕاجیاییەکیش لەنێوان زمانەوانەکان یاخود پێشەوایانی فرەخوێندنەوەی قورئان (الْقُرَّاء)دا هەبێت سەبارەت بەم قیرائاتانە، ئەوە تەنها سەبارەت بەوەیە کە "کێ، چی لەو قیرائاتانە بەلاوە پەسەندترە؟"، لەبەرئەوەی سەرجەم ئەو فرە خوێندنەوانە بەتایبەتیش ئەوەی ناسراوە بە "حەوت جۆرەکەی خوێندنەوەی قورئان" (القراءات السبع) هەموویان لەئاسمانەوە دابەزیون و لای خواوە هاتوون.

ـ لەعومـەری کـوڕی خەتتابـەوە خـوا لێـی ڕازی بێـت گێڕدراوەتـەوە کـە فەرموویـەتی: ڕۆژێك کـە هێشـتا پێغەمبـەری خـوا لەژیانـدا بـوو، گوێبیسـتی "هیشـامی کـوڕی حـەکیم" بـووم کـە سـورەتی (الفرقـان)ی دەخوێنـدەوە، گـوێمگرت بـۆ خوێندنەوەکـەی، دەبیـنم بەشـێوەی جۆربـەجۆری ئـەوتۆ دەیخوێنێتەوە کە پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لێبێت بەو شێوەیە بەمنی نەخوێندووەتـەوە و وەهـای فێرنـەکردووم، خـەریك بـوو پـەلاماری بـدەم لەنوێژەکەدا، بەڵام وەستام تا لەنوێژەکەی بوویـەوە، پاشـان بەجلەکانییـەوە پێچام گرتم و وتم: کێ ئەم سـورەتەی فێرکردوویـت کـە ئێسـتا گـوێم لـێ بـوو دەتخوێندەوە؟ وتی: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێبێت) فێـری کـردووم، وتم: هەڵـەت کـرد، سـوێند بـەخوا پێغەمبـەری خـوا (سـەلامی خـوای لێبێـت) فێـری مـنی کـردووە بەشـێوەیەك جیـاوازبووە لـەوەی تـۆ. ئـەنجا بەجلوبەرگەکەی خۆی لولم کرد و بردم لەگەڵ خۆمدا بۆلای پێغەمبـەری خـوا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، مـن گوێبیسـتی ئەمـە بـووم سـورەتی (الفرقـان)ی دەخوێنـدەوە بەشـێوەیەکی جیـاواز لـەوەی تـۆ فێـرت کـردووم و بۆتخوێندوومەتەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێـت) فـەرمووی: بـەری بدە عومـەر، ئـادەی هیشـام بخوێنـە. هیشـام بەوشـێوەیەی کـە دەیخوێنـد، دەستیکرد بەخوێندنەوە، ئەنجا پێغەمبـەری خـوا فـەرمووی: ئـاوا دابـەزیوە. پاشان فەرمووی: تۆش بخوێنە عومەر، منیش بەوشێوەیەی کـە خـۆی فێـری کردبووم خوێندم، ئـەنجا فـەرمووی: ئـاوا دابـەزیوە، ئـەم قورئانـە بەشـێوەی (حـەوت پیـت) دابـەزیوە، کەواتـە چـەندەتان بـۆکرا ئەوەنـدە بیخـوێنن. (فەرموودەکە هەردوو ئیمامی بوخاری و موسـلیم گێڕاویانەتـەوە، بـۆ نمونـەی

زیاتریش سەیری کتێبی قیرائات بەتایبەتی پێشەکیی کتێبی (تقریب النشر في القراءات العشر)ی ئیبنولجەزەری بکەن).

گرنگە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە حەوت جۆرەکەی خوێندنەوەی قورئـان کـە وا ڕێککـەوتووە (حـەوت جـۆر) بـن لەبەرئـەوەی قاریئـە بەناوبانگەکانیان کە سەنەدی خوێندنەوەکەیان گەیشتووەتێ حەوت کەس بوون، ئەم (قیرائاتی سەبع)ـە جیاوازە لە حەوت پیت (الحروف السبعة)ی کـە لـە فەرموودەکـەی پێشـوودا باسـکراوە و مەبەسـت لێـی: شـێوەزارە ناوچەییەکان و شوێنگە جیاوازەکانی دەربڕینی پیتەکان (مخارج الحروف) بووە و ئەم دووانەش لەکەسێکی ڕۆشنبیر و نەخوێندەوار و گـەنج و پـیردا جۆراوجـۆر دەردەکـەون، واتـە: گـەنجێك، یـاخود خوێنـدەوارێك پیتـەکان بەشێوەیەك دەردەبڕێت و وشەکان گۆدەکات کـە جیـاوازیی هەیـە لەگـەڵ پیرێـك یـاخود نەخوێندەوارێکـدا، ئـەم ڕووداوەی خـوارەوەش زیـاتر باسەکەمان بۆ ڕووندەکاتەوە:

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) لەلای چیایەك لەناوچـەی قوبـا بە جبریل گەیشت، فەرمووی: ئەی جبریل، من نێردراوم بۆلای ئوممەتێکی نەخوێندەوار، پەککەوتەیان تێدایـە، پـیر و بەتەمـەنیان تێدایـە، منـداڵ و ئافرەت و پیاوانێکیان تێدایە کە هـەرگیز نووسـراوێکی نەخوێندووەتـەوە. جبریـل فـەرمووی: ئـەی محەممـەد! قورئـان بـە حـەوت پیـت دابـەزیوە، لەگێڕانەوەیـەکی دیکـەدا فـەرمووی: بـا قورئـان لەسـەر حـەوت پیـت بخوێننەوە. (ئیمامی تیرمیزی لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویەتییەوە).

**لەكۆتاييدا** كەوا گەيشتوومەتە كۆتـايى يەكـەم گەشـتم بـۆ تـوێژينـەوە لەئيعجازيى نوێگەريى لـە زمـانى قورئانـدا و لەئامادەكارييـدام بـۆ ئـەوەى دەستكەم بە دەرياوانيى لـە ئاسـۆگەلى سـورەتە پيرۆزەكانيـدا، سـورەت لەدواى سورەت، و ئايەت لەدواى ئايەت، پێويسـتە دان بـەوەدا بنـێم ئـەم كارە "سەركێشى"يەكى مرۆيى بەدواداگەڕانى لاوازى كەموكورت بوو، جـا بــا چــەندێك پۆشــاكى زانســت و بابەتيبوونيشــى پۆشــيبێت. هـــەموو تاوتوێكردنێكى مرۆييانەى ئەم زمانە ئاسمانييـە دەستەوسـانكارە هـەموو بەرخوردێك لەگەڵيدا لەوە زياترى شايان نييە كـە بە"سەركێشـى" پەسـن بكرێت. چونكە ئێمە داندەنێين بەدەستەوسانى و لاوازييمانـدا لەبەرامبـەر ئـەم گوزارشــتە ئيلاهييــە كامــڵ و بێلەكەيـەدا كــە هــەرگيز ناڕاســتى و كەموكوڕى و لاوازى و هەڵە ڕووى تێناكات و لەو هەڵەوپەڵانە پارێزراوە.

ئێستاشى لەگەڵدا بێت ئەو ئاڵنگارييە ئيلاهييەى كـە بـۆ عـەرەب هـات بەوەى كە "سورەتێكى هاوشێوە"ى ئەم قورئانە بهێنن، هەر بەردەوامە و هــەر دەڵێــى تازەبــەتازە دابــەزيوە. ســەرەڕاى هــاتنى يەكلــەدواى يــەكى بليمـەتى و بليمـەتان و تێپـەڕبوونى سـەردەم و سـەدە جياوازەكـان هـيچ شتێك نەيتوانى تانەى لێبدات يان ڕكەبەرى و كەلـلـەڕەقيى لەتەكدا بكات.

# گرنگترین سەرچاوەکان


– الأصبهاني، أبو بكر أحمد بن الحسين. المبسوط في القراءات العشر. تحقيق سبيع حمزة حاكمي. مؤسسة علوم القرآن ببيروت ودار القبلة بجدة: ١٩٩٥ .

– الأنصاري، أحمد مكي، نظرية النحو القرآني. دار القبلة (؟): ١٤٠٥ ه.

– الباقلاني، القاضي أبو بكر محمد بن الطيب. إعجاز القرآن. تعليق وتخريج صلاح بن عويضة. دار الكتب العلمية، بيروت ٢٠٠١ .

– الجرجاني، عبد القاهر. دلائل الإعجاز. تعليق محمود محمد شاكر. دار المدني، القاهرة وجدة: ١٩٩٢.

– ابن الجزري، محمد بن محمد. تقريب النشر في القراءات العشر، تحقيق إبراهيم عطوة عوض، دار الحديث، القاهرة: ١٩٩٦ .

– الرازي، الفخر. التفسير الكبير، دار إحياء التراث العربي، بيروت : ٢٠٠١ .

– الزايد، سميرة، الجامع في السيرة النبوية، المطبعة العلمية (؟): ١٩٩٥.

– الزركشي، بدر الدين محمد بن بهادر. البرهان في علوم القرآن. تحقيق محمد أبو الفضل إبراهيم. دار إحياء الكتب العربية، القاهرة: ١٩٥٨.

– السكاكي، أبو يعقوب يوسف. مفتاح العلوم، تحقيق عبد الحميد هنداوي، دار الكتب العلمية، بيروت : ٢٠٠٠.

– السيوطي، جلال الدين. الإتقان في علوم القرآن. تحقيق محمد سالم هاشم. دار الكتب العلمية، بيروت : ٢٠٠٣.

– السيوطي، جلال الدين. جامع الأحاديث للمسانيد والمراسيل. جمع وترتيب أحمد عبد الجواد وعباس أحمد صقر. مطبعة محمد هاشم الكتبي، دمشق : ١٩٨١.

– الشوكاني، محمد بن علي. فتح القدير: الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير. دار الفكر، القاهرة : ؟

– الطبري، أبو جعفر محمد بن جرير. جامع البيان في تأويل القرآن. دار الكتب العلمية، بيروت : ١٩٩٩ .

– عضيمة، محمد عبد الخالق. دراسات لأسلوب القرآن الكريم. دار الحديث، القاهرة: ٢٠٠٤ – العلواني، طه جابر. نحو موقف قرآني من النسخ. مكتبة الشروق الدولية، القاهرة: ٢٠٠٧ .

–القراهي، عبد الحميد، تفسير نظام القرآن وتأويل الفرقان بالفرقان. الدائرة الحميدية، الهند: ٢٠٠٠ .

– القطان، مناع، مباحث في علوم القرآن، مؤسسة الرسالة، بيروت : ١٩٩٨.

– الكتاب المقدس، دار الكتاب المقدس في الشرق الأوسط، بيروت : ٢٠٠٤.

– الكتاب المقدس. (؟)، إصدار دار الكتاب المقدس في العالم العربي : ١٩٨١

– لانج، جيفري، حتى الملائكة تسأل. ترجمة زين نجاتي، مكتبة الشروق الدولية، القاهرة: ٢٠٠٢ .

_Asad, Muhammad. The Message of the Qur'an. Bristol (England), The Book Foundation. Vol. 5, P: 758.

- Islahi, Amin Ahsan. Pondering over the Qur'an. translated by M.S.Kayani. London: 2003.

- The Holy Book. King James Version, Collins' Clear-Type Press London: 1950 Good News for Modern Man (the New Testament in today's English Version). American Bible Society: 1966 .

-The Holy Bible, Containing The Old and New Testament. Rivised Standerd Version. Division of Christian Education of the National Council of the Churches of Christ in the U.S.A. Great Britain: 1971.

- The Holy Bible. Trinitarian Bible Society. London: 2000.

- Luxenberg, Chnstoph. The Syro-Aramaic Reading of the Koran: A Contribution to the Decoding of the Language of the Koran. English Edition. Germany: 2007.

- Murry, Middleton. The Problem of Style. Oxford 1960.



# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی ڕۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ک - ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

- فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و ڕوونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکلیات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.
- گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و ڕۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامی.
- چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها ڕۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێک دەگرێتەبەر لەوانەش:

- بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.
- هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.
- ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەک زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

لغة القرآن الكريم

إعجاز أم مجرد عبقرية؟

مختصر كتاب




المعهد العالمي للفكر الإسلامي

هەر دۆزینەوەیەکی ئیعجازییانەی ڕەوانبێژی یان زمانەوانی یان زانستی لە قورئاندا، جا چەندێك شکڵ و شێواز و (ڕێ وشوێن)ی بابەتییانەی گرتبێتەبەر، هەر لە سنوری بە پەسەندزانین (تەرجیح)دا دەمێنێتەوە و دەکەوێتە ژێر یاسای ئەگەرەکانی هەڵەی مرۆییەوە. هەرچییەکیش ئێمە لەم ڕێگەیەدا و لەمبارەوە دەیهێنین و باسی دەکەین هەمووی تەنها و تەنها هەوڵێکی دڵسۆزانەیە بۆ نزیکبوونەوە لە ڕاستیی ڕەها، کە لە کۆتاییدا خۆمان دەستەوسان دەبینینەوە لەوەی بگەین پێی مادام ئێمە بەتوانا مرۆییە لاواز و کەمبڕ و سنوردارەکەمانەوە مامەڵە لەگەڵ ناکۆتا و بێسنوری ئیعجازی خواییدا دەکەین.

نرخ (٢٠٠٠) دینار